# بنەڕەتدۆزی بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا



ئامادەکردن و وەرگێڕانی:

ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و فەرموودەدا



لە بڵاوکراوەکانی

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی (٨٠)

# بنەڕەتدۆزی بۆ ئیعجازی زانستی

# لە قورئان و سوننەتدا

**ئامادەکردن و وەرگێڕانی:**

**ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی لەقورئان و فەرمودەدا**

# بنەڕەتدۆزی بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا



لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی
بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی ژمارە ( ٨٠ )

- نووسینی: ژمارەیەک توێژەر
- وەرگێڕانی : ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی
- بابەت: زانستی
- دیزاین: ڕەوشت محەمەد
- هەڵەچن: باخان ئەحمەد
- چاپ: یەکەم. ٢٠١٩. ناوەندی ڕینوێن.

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (٦٦٦)ی ساڵی ٢٠١٩ی پێدراوە.

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
www.zahawi.org
ناونیشان: شەقامی سالم
تەلاری جەمالی حاجی عەلی نزیک پردی خەسرەوخال
07702422171

# ناوەرۆک

به ناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

# پێشەکی لیژنەی وەرگێڕان

سوپاس و ستایشی نەبڕاوە بۆ خوای گەورە...

درووود و سڵاوی شایستە لەسەر پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر) و خانەوادە و کەسوکاری، ڕەزامەندی و میهرەبانیی پەروەردگار لەسەر هاوەڵ و شوێنکەوتووانی تا ڕۆژی دوایی، لەم پێشەکییەدا بەکورتی ئاماژە بۆ چەند خاڵێک دەکەین:

١. سەرەتا داوای لێخۆشبوون لە خوای میهرەبان دەکەین، پاشان داوای لێبووردنمان ئاراستەی خوێنەرانی بەڕێزیش دەکەین، بۆ ئەوەی کاری وەرگێڕانی ئەم پەرتووکە زۆر دوا کەوت، کە دەبووایە زۆر زووتر لە ئێستا لەبەر دەستی خوێنەراندا بووایە.

٢. سوپاس و پێزانینمان بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی، کە بەشدار بوون لەم کارەدا، بە هەر شێواز و ئەندازەیەک، دەستی هاوکارییان درێژ کردووە بۆ بە ئەنجامگەیاندنی، خوای گەورە پاداشتی چاکەی هەر هەموویان بداتەوە و سەرفرازی دین و دنیا و دواڕۆژ بن.

٣. وەک ئاشکرایە هاتنەخوارەوەی قورئانی پیرۆز، نزیکەی بیست و سێ ساڵی خایاندووە و ئایەتەکانی لە کات و شوێن و هەلومەرجی جیاواز و بۆنەی جۆراوجۆردا ڕەوانە کراون. لە هەمان واقعیشدا، فەرموودەکانی پێغەمبەرمان (درووودی خوای لەسەر) بەپێی بارودۆخی ژیانی ڕۆژانە لێرە و لەوێ و بە جیاجیا ڕاگەیەنراون.

ئەم ڕاستییە گۆشەیەکی زۆر پرشنگدارە بۆ ڕوانین لە ئیعجاز بەگشتی و ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا بەتایبەتی، چونکە سەرەڕای ئەوەی وردەکارییەکانی ڕووەکانی ئیعجازەکە بەناو ئایەت و فەرموودەکاندا دابەش بوون و بڵاو بوونەتەوە، بەڵام کاتێک توێژەر ئایەت و فەرموودەکان دەربارەی هەر

بابەتێکی دیاریکراو کۆ دەکاتەوە؛ سەرەنجام خۆی لەبەردەم وێنەیەکی تەواو تێروتەسەلدا دەبینێتەوە، بەبێ ئەوەی ڕەونەقی دیمەنەکانی ئیعجازی سەربەخۆی هەر ئایەت و فەرموودەیەک کەم بکاتەوە.

٤. ئەگەرچی لە دەقەکانی قورئان و سوننەتدا وشەی (آية) یان (برهان) لەبری (معجزة) بەکار هاتووە، بەڵام شتێکی حاشاهەڵنەگرە، کە لەو باسانەی خزمەتیان بە زانستەکانی قورئان و سوننەت کردووە؛ زاراوەکانی (معجزة) و (إعجاز) جێگەی خۆیان کردووەتەوە.

هەر چەند نابێت ئەوەمان لەیاد بچێت، کە هەمیشە زاراوەکانی نێو دەقەکانی قورئان و سوننەت لە پێشتر و بەهێزترن و گەڕانەوە بۆ بەکارهێنانیان؛ زامنی ئەوەن کە واتاگەلێکی ڕەسەن ببەخشن و بنەڕەتێکی پتەو بن بۆ تێگەیشتنێکی ڕاست و دروست و دوور لە هەموو لادان و مۆرکێکی نامۆ. هاوکات لەگەڵ ئەمەدا، ڕەتکردنەوەی بابەت و توێژینەوەکانی ئیعجاز بە بەهانەی ئەوەی، کە ئەم زاراوانە لە قورئان و سوننەتدا بەکار نەهاتوون؛ ئاڕاستەیەکی نادروستە و تێڕوانینێکی دوورە لە ڕێڕەوی لێکۆڵینەوەی زانستیی ڕەسەن و سەنگین، چونکە ناوەرۆکی زاراوەکان سەنگی مەحەکن.

دەشێت لەم بوارەدا ئەوە بڵێین: ئەم زاراوانە مشتومڕ ناخوازن (لا مشاحة في الإصطلاح)، نموونەش زۆرە لەم بارەیەوە، لەوانە: زاراوەی (عقيدة)،کە لە قورئان و سوننەتدا بەدی ناکرێت، بەڵام پانتاییەکی زۆری داگیر کردووە لە سەرچاوەکاندا.

جا هەروەک چۆن ناکرێت ئەو باس و لێکۆڵینەوە و سەرچاوانە وەلا بنرێن، کە لەجیاتیی (إيمان)؛ زاراوەی (عقيدة)یان بەکار هێناوە، بە هەمان شێوەش ناگونجێت بابەتەکانی ئیعجاز فەرامۆش بکرێت، تەنها لەبەر ئەوەی وشەی (إعجاز) و (معجزة) لە جێی (آية) و (برهان) بەکار هێنراون.

٥. ئەم توێژینەوانەی لەم پەرتوکەدا هاتوون بریتین لەگوڵبژێرێک لەو توێژینەوانەی کە پێشکەشکراون لە (کۆنفرانسی جیهانی بۆ ئیعجازی زانستی لە

قورئان و سوننەتدا) کە لە ٢٥ ـ ٢٨ / سەفەر/ ١٤٠٨ کۆچی بەرامبەر بە ١٨ - ٢١ / تشرینی یەکەم/ ١٩٨٧ زایینی لە ئیسلامئابادی پایتەختی پاکستان، ئامانج لە هەڵبژاردنیان لە دووتوێی ئەم کتێبەدا، هەروەکو لە ناونیشانەکەیەوە دیارە؛ ساغکردنەوەی بنەڕەتەکانی ئیعجازی زانستییە لە قورئان و سوننەتدا، چونکە بواری ئیعجازی زانستی وەکو بەشێکی نوێ لە باسەکانی ئیعجازدا، ئەوە دەخوازێت کاری بنەڕەتدۆزیی (تأصیل)[1]ی بۆ ئەنجام بدرێت و ئەو دەقانەی قورئان و سوننەت دەستنیشان بکرێن، کە بوون بە بنچینە و بنەڕەتی ئیعجازی زانستی، بە واتایەکی تر: باسکردن لەوەی کە ئایا ئیعجازی زانستی لەسەر کام دەقانە دامەزراوە. کە وابوو توێژینەوەکانی تایبەتن بە سەلماندنی تێکڕای بابەتی ئیعجازی زانستی لە ڕووی ڕاست و دروستییەوە لەبەر ڕۆشنایی دەقەکانی قورئان و سوننەتدا، نەوەک بە باسکردنی نموونە و وێنەکانی ئیعجازی زانستی لە بوارە جیاجیاکاندا.

٦. لە کۆتاییدا داواکارین لە خوای گەورە و بەخشندە، ئێمە و خوێنەری بەڕێز و سەرجەم مسوڵمانان بەرچاوڕۆشن بکات بۆ ناسینی هەق و یارمەتیدەرمان بێت بۆ شوێنکەوتنی، هەروەها بمانپارێزێت لە گومڕایی..

وآخر دعوانا أن الحمدلله رب العالمين

**لیژنەی وەرگێڕانی**
**ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی لە**
**قورئان و سوننەتدا**

---

[1] (تأصیل) بە واتا گشتییەکەی بریتییە لە:دەستنیشانکردنی بنچینە یاخود بنەڕەتی هەر شتێک یان مەسەلەیەک.واتە: بەدەرخستنی ئەو بنچینەیەی، کە شتەکەی لەسەر دامەزراوە، یاخود ئەو بنەڕەتەکەی، کە مەسەلەکە پشتی پێ بەستووە. کەواتە وشەی (بنەڕەتدۆزی) لەبریی (تأصیل) بەکار هێنراوە و مەبەست لێی کاری بەدواداگەڕان و دۆزینەوە و دەستنیشانکردنی بنەڕەتەکان بە شێوەیەکی گشتی، لێرەشدا مەبەست لێی خستنەڕووی بنەڕەتەکانی ئیعجازی زانستییە لە قورئان و سوننەتدا.

# پێشەکی

**سوپاس بۆ خوای گەورە، درووود و سڵاو لە پێغەمبەری سەروەرمان و لە کەسوکار و هاوەڵانی.**

مرۆڤایەتی، هەر لە سەردەمی بەرپابوونی شۆڕشی پیشەسازییەوە لە ئەورووپا و تا ئێستاش، لە ململانێی نێوان زانست و ئاییندا دەژی، گۆڕەپانی ململانێکەش بە جۆرێک فراوان بووە، کە زۆربەی بوارەکانی زانست و زانیاری لە شوێنە جیاجیاکانی جیهاندا گرتووەتەوە.

ئەم جەنگەی نێوان زانست و ئایین، کە ئایینێکی شێوێنراو و دەستکاریکراو تیایدا پێشەنگ بوو، مرۆڤایەتیی تووشی بەدبەختی کرد، چونکە وەها کەوتە پێشچاو، کە ئایین بەدۆڕاوی لە گۆڕەپانی ململانێکە هاتبێتە دەرەوە.

بەم دۆڕاندنەی ئایینیش، مرۆڤایەتی سەری لێشێوا و کەوتە ناو گێژاوەکانی تاریکی و سەرگەردانییەوە، تا وای لێهات بەبێ ڕێنمایی؛ شتەکان تاقی بکاتەوە، بێ هیچ ئامانجێک ملی ڕێگە بگرێتە بەر و جار لەدوای جار زووخاوی تێکشکانە دواییەکەکان بنۆشێت و لە ساتێکەوە بۆ ساتێکی تر تاڵاوی شکستە دووبارەکان بچێتەوە بە قورگیدا.

ئەمەی باس کرا؛ لە بارودۆخێکدا ڕووی دا، کە (ئیسلام) لە گۆڕەپانی ئەو جەنگەدا نەبوو، بەڵکو ئایینێکی دەستکاریکراو لەئارادا بوو، چونکە ئاشکرایە ئیسلام ئەو ئایینە ڕاستەیە، کە هەردەم لەگەڵ هەقدا بە هەموو وێنەکانیەوە

دەگونجێت، بەڵکو ئیسلام هەق لەئامێز دەگرێت و هەر چۆنێک و لە هەر جێگەیەک و لە هەر لایەکەوە بێت؛ پشتیوانیی لێ دەکات.

وەک لە فەرموودەی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر) هاتووە: ((الكلمة الحكمة ضالة المؤمن، فحيث وجدها فهو أحق بها[1])). واتە: "وتەی دانایی؛ ونبووی باوەڕدارە، لە هەر شوێنێک دۆزییەوە؛ لە هەموو کەسێک شایستەترە پێی."

ئیسلام ئەو ئایینەیە، کە زانستی کردووە بە بەرنامە بۆ ناسینی خوای پاک و بێگەرد و ناسینی پێغەمبەرەکەی (دروودی خوای لەسەر)، هەروەها بۆ ناسینی خودی ئایینەکە و ڕوونبوونەوەی ڕاستی و دروستییەکەی، هەروەک چۆن کردوویەتی بە بەرنامەیەک بۆ ناسینی بوون لە دەوروبەرمان.

بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییەش، ئەم دوو ئایەتەمان بەسە وەک بەڵگە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولاً﴾ (الإسراء: ٣٦)، واتە: "(ئەی ئادەمیزاد) لە شتێک مەدوێ و شوێن شتێک مەکەوە کە زانست و زانیاریت دەربارەی نییە، چونکە بەڕاستی ئەندامەکانی بیستن و بینین و تێگەیشتن هەر هەموویان بەرپرسن لە بەرامبەریەوە."

هەروەها دەفەرموێت: ﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَاكُمْ﴾ (محمد: ١٩)، واتە: "چاک بزانە و دڵنیا بە (زانیاریت ببێ)، کە بەڕاستی جگە لە (اللّٰه)، هیچ خوایەکی تر نییە."

زانایانی مسوڵمان لە ڕەوتی ئەم ململانێیەی نێوان زانست و ئایینی شێوێنراو، هەروەها لە هەوڵی دوژمنانی ئیسلام بۆ گواستنەوەی جەنگەکە بۆ ناو وڵاتی مسوڵمانان بەئاگا بوون، لەبەر ئەوە دەستیان کردووە بە نووسین دەربارەی ئیسلام و زانست، لێرەشەوە ڕێیان کەوت لە (موعجیزە)یەک، کە لەم سەردەمەدا ئاشکرا بووە و خوای گەورە ئایینە ڕاست و دروستەکەی خۆی پێ سەلماندووە.

---

[1] الترمذي، كتاب العلم باب ماجاء في فضل العلم على العبادة، ٥/٥١.

ئەو موعجیزەیەش بریتییە لە: "ئیعجازی زانستی" لە قورئان و سوننەتدا.

ئاشکرابوونی ئەم موعجیزەیەش، بەدیهاتنی ئەو بەڵێنەی خوای گەورە و باڵادەست بوو، کە لەم ئایەتەدا ئاماژەی بۆ کراوە، وەک خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت: ٥٣)، واتە: "ئێمە لە ئایندەدا بەڵگە و نیشانەکانی خۆمانیان لە ئاسۆکانی بوونەوەردا و لە خودی خۆیشیاندا نیشان دەدەین، ئەمەش بۆ ئەوەی چاک بۆیان ڕوون بێتەوە و دڵنیا بن، کە قورئان نیگای ڕاست و ڕەوای خوای گەورەیە."

نووسینەکان پەیتا پەیتا لەم بوارەدا دەستیان پێکرد، بەشێکیان پوخت و پاراون و بەشێکیشیان پێویستیان بە ڕاستکردنەوە و ڕێککردنەوە هەیە.

لەبەر ئەوە (ئەنجوومەنی باڵای جیهانیی مزگەوتەکان) دەستپێشخەریی کرد و بڕیاری دا بە دامەزراندنی (دەستەی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا)، تاوەکو لە پێشەنگی کارەکانیدا ئەم ئەرکانەی لای خوارەوە بگرێتە ئەستۆ:

١. پەرەپێدانی توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستی.

٢. پوختەکردن و ڕاستکردنەوەی نووسینەکانی ئەم بوارە.

٣. بڵاوکردنەوەی ئەو توێژینەوانەی دروست و گونجاون.

٤. دانانی چەند ڕێسا و دەستوورێک بۆ نووسین لە بابەتی ئیعجازی زانستیدا.

لە پێناو جێبەجێکردنی ئەم خاڵانەشدا، (دەستەی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا) لەگەڵ (ڕابیطەی جیهانیی ئیسلامی) و (زانکۆی ئیسلامیی جیهانی) لە (٢٥-٢٨ی سەفەری ١٤٠٨ی کۆچی لەبەرامبەر ١٨-٢١ /١٩٨٧/١٠ زایینی)دا؛ یەکەمین کۆنگرەی جیهانییان بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا لە شاری (ئیسلامئاباد) لە پاکستان ساز کرد.

لە گرنگترینی ئەو بابەتانەی لەم کۆنگرەیەدا خرانەڕوو، بریتی بوون لە: توێژینەوەکانی بنەڕەتدۆزی، یاخود بنچینەڕێژی (بحوث التأصيل)، بۆ ئەم زانستە نوێیە لەم سەردەمەی ئێمەدا.

لەبەر گرنگیی ئەم بوارە، دەستەی ئیعجازی زانستی بە باشی زانی، هەندێک لە توێژینەوەکانی بنەڕەتدۆزی پێشکەش بە توێژەران و خوێنەران بەگشتی بکات.

بابەتەکانیش بریتین لەو توێژینەوانەی، کە دەستەی ناوبراو لە کۆبوونەوەی خۆیدا لەگەڵ لیژنەی ڕاوێژکاری لە ١٤-١٦/ڕەمەزان/١٤٠٩ی کۆچی، بڕیاری دا بڵاویان بکاتەوە بۆ ئەوەی سوودیان لێ وەربگیرێت.

هەروەها بە گونجاوی زانی، کە ڕاسپاردەکانی کۆنگرەکەش وەک پاشکۆیەک لەگەڵ ئەم بابەتانەدا دابنێت.

لە کۆتاییدا، لە خوای گەورە و باڵادەست داواکارین، کە دەستگرۆیی کارگێڕانی ئیسلام بکات، لە کارەکانیاندا سەریان بخات و بەرەو ڕێگای ڕاست و دروست ڕێنماییان بکات. دوا پاڕانەوەشمان سوپاسە بۆ خوای پەروەردگاری هەموو جیهانیان.

# بابەتی یەکەم

# موعجیزەی زانستی لە قورئان و سوننەتدا

**شێخ عەبدولمەجید زەندانی**

**ئەمینداری دەستەی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا**

# پێشکەشکردن

**بە پێنووسی شێخی ئەزهەر: بەڕێز شێخ (جادالحق علی جادالحق)**

سوپاس بۆ خوا، کە ئادەمیزادی فێری ئەو شتانە کردووە کە نەیدەزانین، درووود و سڵاو لەسەر پێغەمبەری خوا محەمەد (درووودی خوای لەسەر)، کە پەروەردگاری بەم ئایەتە دواندوویەتی: ﴿وَلَوْلاَ فَضْلُ اللّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُلَهَمَّتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ أَنْ يُضِلُّوكَ وَمَا يُضِلُّونَ إِلاَّ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَضُرُّونَكَ مِنْ شَيْءٍ وَأَنزَلَ اللّهُ عَلَيْكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُنْ تَعْلَمُ وَكَانَ فَضْلُ اللّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا﴾ (النساء: ١١٣)، واتە: "خوای گەورە فێری ئەو شتانەی کردوویت، کە پێشتر نەتدەزانی و هەمیشە فەزڵ و بەخششی خوا لەسەر تۆ زۆر و مەزنە. "هەروەها لەسەر کەسوکار و هاوەڵانی، کە مەشخەڵی زانستەکانی ئەم پەیامەیان هەڵگرت و بناغەیان بۆ دارشت و گەنجینەکانیان واڵا کرد.

**لە پاشان:**

سەرەڕای سەرقاڵیی زۆر و کەڵەکەبوونی کارەکان، بەخێرایی چاوێکم بەو باسەدا خشاند، کە لەلایەن بەڕێز شێخ عەبدولمەجید زندانییەوە بە ناونیشانی (موعجیزەی زانستی لە قورئان و سوننەتدا) پێشکەش کراوە.

لە باسەکەیدا بیرۆکەگەلێکی هێناوە کە خزمەت بە توێژینەوەکەی دەکەن، لەم بیرۆکانەشدا پشتی بە بەڵگە نەقڵییەکانی قورئان و سوننەت بەستووە و بەو بەڵگە ئەقڵیانەش، کە واتاکانیان لە واقیعی هەستپێکراوەوە سەرچاوەیان گرتووە و هاوکات بە ئەنجامی بیردۆزە و ئەزموونە زانستییە نوێیەکانەوە بەندن. توێژینەوەکەی بە پێناسەی (ئیعجاز) دەست پێ کردووە، پاشان پێناسەی (ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا) کردووە.

دواتر لەوە دواوە، کە موعجیزەی هەر پێغەمبەرێک (سەلامی خوایان لێ بێت)، لەگەڵ ئەو بوارەدا گونجاو بووە، کە گەلەکەی پێی ناسراون و تیایدا کارامە بوون.

هەروەها وتوویەتی: (موعجیزەی زانستی) ئەو موعجیزەیەیە، کە لەگەڵ کۆتا پەیامی جیهانی و ئاستە مرۆییە جیاوازەکاندا دەگونجێت و کاتی ئەوەش هاتووە کە دیتنی ڕاستییەکانی ئەو زانستەی قورئان و سوننەت هەواڵیان پێداوە؛ هەوڵی ئاشکراکردنی بدرێت، لەم بارەیەشەوە چەند نموونەیەکی لە هەواڵەکانی قورئان و سوننەت سەبارەت بە زەوی و ئاسمان هێناوەتەوە، کە لە چەرخی دۆزینەوەکاندا دەرکەوتوون. وەک لەم ئایەتانەدا ئاماژەی بۆ کراوە: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾، (فصلت: ٥٣)، واتە: "ئێمە لە ئایندەدا بەڵگە و نیشانەکانی خۆمانیان لە ئاسۆکانی بوونەوەردا و لە خودی خۆیاندا نیشان دەدەین."

﴿لِكُلِّ نَبَإٍ مُسْتَقَرٌّ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ (الأنعام: ٦٧) واتە: "بۆ هەموو هەواڵێک، کە لە قورئاندا هاتووە، کات و شوێنی بەدیهاتنی خۆی هەیە و ئێوە لە ئایندەدا دەیزانن."

﴿إِنْ هُوَ إِلاَّ ذِكْرٌ لِلْعَالَمِينَ(٨٧)وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ(٨٨)﴾ (ص: ٨٧–٨٨) واتە: "ئەم قورئانە ئامۆژگارییەکە بۆ هەموو خەڵکی جیهان لە هەموو کات و شوێنێکدا، بەڕاستی پاش ماوەیەک (لە داهاتوودا) هەواڵی ڕاستی و دروستیی ئەم قورئانە دەزانن."

هەروەها چەندین ئایەتی ترە کە ئاماژەی لەم جۆرەیان لەخۆ گرتووە.

لەم بارەیەشەوە شێخ زندانی وتەی پێشینانی لە زانایانی تەفسیر و فەرموودە و زانایانی بوارەکانی تریش هێناوەتەوە.

سەرەنجام گەیشتووەتە ئەوەی، کە توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستی و ڕێساکانیشی، جۆرێکە لە تەفسیری قورئان و دەچێتە چوارچێوەی (جۆری سێهەم) لەو چوار جۆرە تەفسیرەی (إبن عباس – ڕەزای خوای لەسەر) باسی کردوون، کە فەرموویەتی تەفسیری قورئان چوار جۆرە:

١. جۆرێکیان عەرەب لە واتاکانی زمانی عەرەبییەوە دەیزانن.

٢. تەفسیرێکە هەمووان دەیزانن و کەس بەهانەی نییە بۆ نەزانینی.
٣. تەفسیرێکە زانایان پەیی پێ دەبەن.
٤. تەفسیرێکە جگە لە خوا کەس نایزانێت.

پاشان هاتووەتە سەر باسی جیاوازیی (تەفسیری زانستی) و (ئیعجازی زانستی)، هەروەها ئەوەی ڕوون کردووەتەوە، کە سەرچاوەکانی توێژینەوەی ئیعجازی زانستی؛ لقێکە لە لقەکانی تەفسیری قورئان و بەشێکیشە لە ڕاڤەی فەرموودە، لە هەمان کاتیشدا ئەم سەرچاوانە پەیوەستن بە سەرچاوەکانی زانستە ئەزموونییەکان و مێژوویانەوە، چونکە ئیعجازی زانستی لەسەر ئەوە بەندە، کە ئەو کۆکبوونە و یەکاویەکبوونە (توافق) دەربخات، کە لەنێوان دەقەکانی نیگا و ئەو ڕاستی و نهێنییانەی بوونەوەردا هەیە، کە زانستی ئەزموونی دۆزیونیەتیەوە.

هەروەها باسی لە ڕێساکانی توێژینەوەی ئیعجازی زانستی کردووە و بە شێوەیەکی وا دایڕشتوون و ڕێکی خستوون، کە بابەتی ئیعجازی زانستی لەخۆ بگرن و ڕێساگەلێکی کۆگیر و ئاراستەکار بن بۆ کەسێک، کە لە گۆشەنیگای زانست و ڕێنماییەوە خۆی بدات لە بواری توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستی و ڕێگریش بن لەبەردەم کەسێکدا، کە بەهرەکانی لەم بوارەدا کەموکورت بن و نەتوانێت لەم توێژینەوانە تێبگات و بێئاگا بێت لە زاراوەکانی ئەم زانستە و لە واتای دەقە (ظني) و (قطعي)یەکان و چۆنێتیی پێکەوە گونجانیان، یاخود دژبەیەکبوونیان... بەو شێوەیەی، کە لەم باسە سوودبەخشەدا، بەپوختی یان بەدرێژی باسیان لێ کراوە.

پاشان هاتووەتە سەر باسی ڕووەکانی ئیعجازی زانستی و لە (پێنج) خاڵدا کورتی کردوونەتەوە و گرنگی و بەرهەمی توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستییشی ڕوون کردووەتەوە. باسەکەشی بە ڕوونکردنەوەی بوارەکانی توێژینەوەی ئیعجازی زانستی کۆتایی پێهێناوە و ئاماژەی بەوە کردووە، کە بوارەکان بریتین لەمانەی خوارەوە:

- ئەو بوارانەی بوونەوەر، کە لە قورئان و سوننەتدا باس کراون، یان ئاماژەیان بۆ کراوە و زانستی مرۆڤیش توانیویەتی نهێنییەکانیان ئاشکرا بکات.
- ئەو بوارانەی توێژەر پێویستی پێیان دەبێت بۆ تەفسیر و لێکدانەوەی دەقە شەرعییەکان، بە شێوەیەکی ڕاست و دروست و بێ لادان.
- لایەنی مێژوویی زانستەکان و ڕەوتی پێشکەوتنیان.

هەروەها باسی لەوە کردووە، کە ئەو مەسەلانەی توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستی بایەخیان پێ دەدەن، بریتین لەو مەسەلانەی توێژەر هەوڵ دەدات بۆ شیکردنەوەیان و ئەمانەی لای خوارەوە لەخۆ دەگرێت:

- مەسەلە شەرعییەکان
- مەسەلە بوونەوەرییەکان
- مەسەلە مێژووییەکان

هەموو ئەم مەسەلانەش پێکەوە بەشدارن لە دەرخستنی لایەنەکانی موعجیزەی زانستی لە نیشانەکانی خوای گەورە لە بوونەوەر و خودی مرۆڤەکانیشدا، هاوکات لەگەڵ نووسینی ئەم پێشکەشکردنەدا، سوپاسی برای پایەدار (شێخ عەبدولمەجید زەندانی) دەکەم بۆ ئەم هەوڵەی لە پێناو خزمەتکردنی زانست و ئاییندا، چونکە ئیسلام ڕێزی ناوە لە زانست و خەڵکی هان داوە کۆشش بکەن و هەوڵ بدەن بۆ فێربوونی زیاتر و بۆ تێڕوانینی بەردەوام لە دروستکراوەکانی خوای گەورە، بە مەبەستی وەبەرهێنانی هەر خێر و چاکەیەک، کە لەم دنیایەدایە بۆ کەڵکی دین و دنیای مرۆڤ، بەئومێدی زیادبوونی باوەڕی باوەڕداران و یادخستنەوەی خاوەن ژیرییەکان.

ئیتر هەر خوا پشتیوانە و هەر خۆی یاریدەدەری هەموو کار لەبەر ڕۆیشتنێکە.

# موعجیزەی[1] زانستی لە قورئان و سوننەتدا

## ئیعجازی زانستی:

پێناسەی ئیعجاز: وشەی (الإعجاز) لە وشەی (العجز)ەوە داتاشراوە و (العجز)یش بە مانای: (لاوازی) یان (بێتوانایی) دێت.

(الإعجاز) چاوگی (أعجز)ەیە: مانای (تێپەڕاندن) و (پێشکەوتن[2]) دەگەیەنێت[3].

**موعجیزەش لە زاراوەی زانایاندا بەم جۆرە پێناسە کراوە:**

"شتێکی لەئاسابەدەرە و پەیوەستە بە لە ڕووداوەستان (تحدي) و بە هیچ جۆرێک بەرگری ناکرێت[4]. واتە: "ئەو شتەی ئیعجازی تێدایە، سەرەڕای ئەوەی لە ئاسابەدەرە، لە هەمان کاتدا مانای لەڕووداوەستانی بە ڕووی دەوروبەردا لەخۆ گرتووە، کە هەمووان دەستەوسانن لەوەی بتوانن شتێکی لەم جۆرە بەدەست بهێنن، ئەم دەستەوسانکردنەش شتێکی چەسپاوە و لەبەر ئەمەشە هیچ کەسێک ناتوانێت لە بەردەمیدا بەرگری بکات[5]".

## ئیعجازی قورئان:

مەبەست لە ئیعجازی قورئان ئەوەیە: قورئان خەڵکی دەستەوسان کردووە لەوەی، کە بتوانن لە وێنەی قورئان بهێنن. واتە: سیفەتی (دەستەوسانبوون) دراوەتە پاڵ خەڵکی، بەهۆی بێتواناییانەوە لەوەدا، کە هاوشێوەی قورئان بهێنن[6]

---

[1] موعجیزە: دەرئاسا، شتێکی لەئاسابەدەرە. (وەرگێڕ)

[2] بڕوانە: لسان العرب لإبن منظور مادة عجز ٣٧٠/٥ ط دار صادر بيروت، والمفردات للراغب الأصفهاني، ص٣٢٢

[3] هەروەها بە مانای (دەستەوسانکردن) دێت. (وەرگێڕ)

[4] بۆ مانای ئەوە بڕوانە: تفسير القرطبي ٩٦/١، فتح الباري، ٥٨١/٦.

[5] ئەم زیادە ڕوونکردنەوەیە بە مەبەستی ئاسانکردنی تێگەیشتنە لە پێناسەکە، لەلایەن وەرگێڕەوە دانراوە.

[6] بە دەستەواژەیەکی تر: خەڵکی دەستەوسانن لە ئاستی قورئاندا و هەرگیز ناتوانن لە وێنەی قورئان شتێک بێننە ئاراوە (وەرگێڕ).

**پێناسەی زانست:**

لێرەدا وشەی (ئیعجاز) بە وشەی (زانستی) وەسف کراوە، مەبەستیش لە (زانستی)؛ پەیوەستبوونە بە زانستەوە. زانستیش بریتییە لە: پەیبردن بە شتەکان وەکو ئەوەی خۆیان چۆنن لە ڕاستیدا، یان بە واتایەکی تر: بریتییە لەو سیفەتەی بە هۆیەوە خوازراو، یان مەبەست بەتەواوی ئاشکرا دەبێت و دەردەکەوێت[1].

مەبەستیش لە زانست لەم شوێنەدا: زانستی ئەزموونییە.

بەم پێیە دەتوانرێت ئیعجازی زانستی بەم شێوەیەی لای خوارەوە پێناسە بکرێت:

**پێناسەی ئیعجازی زانستی:**

بریتییە لە باسکردنی ڕاستییەک لە قورئانی پیرۆز، یان سوننەتی پێغەمبەردا (دووری خوای لەسەر)، کە زانستی ئەزموونی سەلماندوویەتی و ئاشکراشە بە ئامرازە مرۆییەکانی سەردەمی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) نەتوانراوە پەی پێ ببرێت، ئەمەش ڕاستگۆیی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) دەردەخات سەبارەت بەو شتانەی لەلایەن پەروەردگارییەوە پێی ڕاگەیاندووین.

**هەر پێغەمبەرێک موعجیزەیەکی هەبووە، کە لەگەڵ گەلەکەی و ماوەی پەیامەکەیدا گونجاوە**

پێغەمبەرانی پێش پێغەمبەری سەروەر (محەمەد – دروودی خوای لەسەر) بۆ گەلەکانی خۆیان بەتایبەت ڕەوانە دەکران، پەیامەکانیشیان بۆ چەند سەردەم و کاتێکی دیاریکراو بووە، لەبەر ئەوە خوای گەورە بە بەڵگەی بەرجەستە و هەستپێکراو پشتگیریی کردوون، وەکو:

---

[1] بڕوانە: الراغب الاصفهاني: المفردات ٣٤٣، الشوكاني: إرشاد الفحول ٤.

گۆچانەکەی پێغەمبەری خوا (مووسا - سڵاوی خوای لەسەر)، زیندووکردنەوەی مردووەکان بە یارمەتیی خوا لەسەر دەستی پێغەمبەری خوا (عیسا - سڵاوی خوای لەسەر).

هێزی قایلکردنی ئەم بەڵگە بەرجەستانەش، تەنیا هێندەی ماوەی دیاریکراو بۆ پەیامی هەر پێغەمبەرێک بەردەوام بووە و درێژەی کێشاوە، ئیتر کاتێک خەڵکەکە ئایینەکەی خوای گەورەیان شێواندووە، پێغەمبەرێکی تری بۆ ناردوون بە پەیامێکەوە، کە خۆی پێی ڕازییە و بە موعجیزەیەکی نوێ و بەڵگەیەکی بینراوی ترەوە.

**موعجیزەی زانستی لەگەڵ دوا پەیام و ئاستە مرۆییە جیاوازەکاندا دەگونجێت:**

کاتێک خوای گەورە بە ناردنی دوا پێغەمبەری سەروەرمان (محەمەد – درووودی خوای لەسەر) کۆتایی بە پێغەمبەرایەتی هێنا؛ پاراستنی ئایینەکەشی بۆ دەستەبەر کرد، بە بەڵگەیەکی هێندە گەورەش پشتیوانیی لێ کرد، کە تا کاتی بەرپابوونی قیامەت -ئەم بەڵگەیە- لەبەر دەستی خەڵکیدا بمێنێتەوە، خوای گەورە دەفەرموویێت ﴿قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادَةً قُلْ اللَّهُ شَهِيدٌ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَذَا الْقُرْآنُ لِأُنذِرَكُمْ بِهِ وَمَنْ بَلَغَ أَ ئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ اللَّهِ آلِهَةً أُخْرَى قُلْ لاَ أَشْهَدُ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَهٌ وَاحِدٌ وَإِنَّنِي بَرِيءٌ مِمَّا تُشْرِكُونَ﴾ (الأنعام: ١٩)، واتە: "ئەی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر) بەوانە بڵێ، کە شایەتیان دەوێت لەسەر پێغەمبەرایەتیی تۆ: چ شتێک گەورەتر و ڕاستترە لە شایەتیدا؟ هەر خۆت بڵێ (اللّه) ڕاستترین شایەتە، کە شایەتیی نێوان من و ئێوەیە، من ئەم قورئانەشم بە نیگا بۆ هاتووە تا ئێوە و هەموو ئەوانەی پێیان گەیشتووە؛ ئاگادار و بێدار بکەم."

لەمەشدا؛ واتە لە بەڵگەهێنانەوەدا بە قورئان، بەشێکی پەیوەستە بە موعجیزەی زانستییەوە. خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿لَكِنْ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ وَالْمَلاَئِكَةُ يَشْهَدُونَ وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا﴾ (النساء: ١٦٦)، واتە: "ئەی محەمەد

(درووودی خوای لەسەر)، هەر چەندە ئەو خەڵکە باوەڕت پێ ناکەن، بەڵام خوای گەورە خۆی شایەتیت بۆ دەدات بەم قورئانەی، کە بۆ تۆی ناردووەتە خوارەوە و زانیاریی خۆی تێدا ناردووە. ئەم ئایەتە بۆ پەرچدانەوەی ئەو بێباوەڕانە هاتووەتە خوارەوە، کە پێغەمبەرایەتیی دوا پێغەمبەریان (محەمەد - درووودی خوای لەسەر) بەدرۆ دەخستەوە، هاوکات سروشتی موعجیزەی زانستییشی ڕوون کردووەتەوە[1].

ئەو موعجیزەیەی هەردەم لەبەر دەستی خەڵکیدا دەمێنێتەوە و لەگەڵ هەموو سەرکەوتنێکی مرۆڤایەتییشدا نوێ دەبێتەوە، کە لە ئاسۆکانی ئەو زانست و زانیارییانەی پەیوەستن بە واتاکانی نیگای خواییەوە، بەدەستی دێنێت.

(خازین) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: "ئەی (محەمەد — درووودی خوای لەسەر)، خوای گەورە بە هۆی ئەم قورئانەوە، کە ناردوویەتیە خوارەوە بۆ سەر تۆ؛ شایەتیی پێغەمبەرایەتیت بۆ دەدات[2]." (إبن كثير)یش دەڵێت: "خوای گەورە شایەتیت بۆ دەدات، کە تۆ پێغەمبەری ئەویت و پەرتووکی ناردووەتە خوارەوە بۆت، کە قورئانی مەزنە... هەر لەبەر ئەمەش فەرموویەتی (أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ) واتە: ئەو زانستە خواییەی تیایە، کە خوا ویستوویەتی بەندەکانی لێی بەئاگا بن و بیزانن، ئەو زانستەش بریتییە لە: (بەڵگەکان و ڕێنمایی و جیاکەرەوە (الفرقان) و ئەو شتانەی خوا پێی خۆشە و پێیان ڕازییە و ئەو شتانەش، کە ئەو پێی ناخۆشە و نایەوێن، هەروەها ئەو زانیارییانەش دەربارەی پەنهانەکانی ڕابردوو و داهاتوون[3].

(أبوالعباس إبن تيمية) دەڵێت: "شایەتیدانی خوای گەورە بەوەی، کە ناردوویەتیە خوارەوە بۆ پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر)؛ بریتییە لە شایەتی خوای گەورە لەسەر ئەوەی، کە (لەلایەن خۆیەوە قورئانی ناردووە و زانستی

---

[1] بۆ هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکە بڕوانە: (إبن الجوزي: ٢/٢٥٧، الطبري: ٥/٢٢، إبن كثير: ١/٥٩٠، الجلالين: ١٣٧).

[2] الخازن في مجموعة من التفاسير، ٢/٢١٠

[3] ابن كثير، ١/٥٦٠

خۆی تیادا ناردووەتە خوارەوە)، چونکە هەر هەواڵێکی ناو قورئان بریتییە لە باسێک دەربارەی زانستی خوا، نەک دەربارەی زانستی کەسێکی تر.[١]

مانای ئەم ئایەتەش هاوواتایە لەگەڵ ئەم ئایەتەی تردا کە دەفەرمووێت: ﴿فَإِلَّمْ يَسْتَجِيبُوا لَكُمْ فَاعْلَمُوا أَنَّمَا أُنزِلَ بِعِلْمِ اللَّهِ وَأَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ فَهَلْ أَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾ (هود: ١٤). واتە: "جا ئەگەر خوانەناسان نەهاتن بەدەم ئەم داوایەتانەوە، ئەوا ئێوە چاک بزانن و دڵنیا بن لەوەی، کە ئەم قورئانە تەنیا بە زانستی خوا نێردراوەتەوە خوارەوە." واتای (بِعِلْمِ اللَّهِ) تەنیا ئەوە نییە، کە هاتنەخوارەوەکەی لای خوا زانراو بێت، چونکە هەموو شتەکان لای خوا زانراون و ئەمەش خۆی بۆخۆی هیچ بەڵگەیەک لەخۆ ناگرێت لەسەر ڕاست و ڕەوایی قورئان، بەڵکو واتاکەی بەم شێوەیەیە: زانستی خۆی تیادا ناردووەتە خوارەوە، هەروەکو چۆن دەوترێت: "فلان يتكلم بعلم"، واتە: "قسەکانی فڵانە کەس زانستیان تیایە، نەک ماناکەی ئەوە بێت قسەکردنەکەی لای خۆی زانراو بێت." خوای گەورەش زانستی خۆی لە قورئانەکەیدا ناردووەتە خوارەوە، هەروەکو دەفەرمووێت: ﴿قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ غَفُورًا رَحِيمًا﴾ (الفرقان: ٦) واتە: "ئەی (محەمەد – دروودی خوای لەسەر)، بڵێ: زاتێک ئەم قورئانەی ناردووەتە خوارەوە، کە هەموو نهێنییەکی ئاسمانەکان و زەوی دەزانێت•."

زۆرێک لە زانایانی تەفسیر واتای(أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ)یان بەو چەشنە تەفسیر کردووە کە باسکرا[٢].

---

[١] بۆ تەفسیرەکەی (إبن تيمية) بڕوانە: الفتاوى: ١٤/١٩٦.

• لەم ئایەتەوە، کە تەفسیرێکە بۆ دوو ئایەتەکەی تر (واتە ئایەتی ١٦٦ی النساء و ئایەتی ١٤ی هود) دەردەکەوێت: کە باسەکانی بوونەوەر و وەسفەکانی زەوی و ئاسمانەکان و... هتد لە قورئاندا، بەشێکن لە زانستی خوای گەورە، کە ویستوویەتی بەندەکانی لێ ئاگادار بکات و بە بینینیان لە واقیعدا؛ ڕاستیی قورئانیان لەلا بچەسپێت. (وەرگێڕ)

[٢] ابن الجوزي: ٢/٢٥٧، الزمخشري: ١/٥٨٤، أبو حيان: ٣/٣٩٩، ألآلوسي: ٦/١٩-٢٠، الشوكاني: ١/ ٥٣٩، البيضاوي والنسفي والخازن في كتاب مجموعة من التفاسير: ٢/٢١٠، الجلالين: ١٣٧.

بەم جۆرەش بەڵگەی ئەو نیگایەی نێردراوەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر (محەمەد - دروودی خوای لەسەر) دەردەکەوێت و ئاشکرا دەبێت، چونکە (نیگا) زانستێکی خوایی لەخۆ گرتووە کە خەڵکی لە هەموو کات و شوێنێکدا دەرکی پێ دەکەن و بە درێژایی سەردەمەکانیش نوێ دەبێتەوە.

هەر لەبەر ئەمەشە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) فەرموویەتی: ((ما من الأنبياء نبي إلا أعطي من الآيات ما مثله آمن عليه البشر، وإنما كان الذي أوتيته وحيا، أوحاه الله إلي، فأرجو أن أكون أكثرهم تابعا يوم القيامة)). البخاري: فتح الباري ٣/٩، مسلم - كتاب الإيمان. واتە: "هەر پێغەمبەرێک لە پێغەمبەران بەڵگەیەکی وەهای پێ دراوە، کە بە هۆیەوە مرۆڤەکانی سەردەمی خۆی باوەڕی پێ بهێنن، بەڵام ئەو بەڵگەیەی، کە بە من دراوە -جیاوازە لەوەی ئەوان[1]-؛ نیگایەکە خوای گەورە بۆی ناردووم، هەر بۆیە ئومێد دەکەم لە ڕۆژی دواییدا لە هەموو پێغەمبەران شوێنکەوتووم زیاتر بێت."

(إبن حجر) لە ڕاڤەی ئەم فەرموودەیەدا وتوویەتی: "موعجیزەی قورئان و دەرئاسایی لە شێواز و ڕەوانبێژییەکەیدا و باسکردنی شتە پەنهانەکاندا، هەموو ئەمانە تا ڕۆژی دوایی بەردەوامە، هیچ چەرخێکیش تێپەڕ نابێت بەبێ ئەوەی یەکێک لەو شتانەی، کە قورئان هەواڵی ڕوودانی داون؛ دەرنەکەوێت، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ڕاست و دروستیی بانگەوازەکەی قورئان... لەبەر ئەوە سوودی قورئان گشتگیرە بۆ هەمووان، چ ئەو کەسانەی ئەوسا ئامادە بوون و چ ئەوانەش لەوێ نەبوون چ ئەوانەی لەمەوپێش لە بووندا بوون و چ ئەوانەی لەمەودوا دێن[2]".

﴿إِنْ هُوَ إِلاَّ ذِكْرٌ لِلْعَالَمِينَ(٨٧)وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ(٨٨)﴾ (سورة ص: ٨٧-٨٨).

---

[1] لە ڕووی گەورەیی و بەردەوامیی کاریگەرییەوە، چونکە بەڵگەی پێغەمبەرانی ڕابردوو بە نەمانی خۆیان؛ بەڵگەکانیشیان نەماوە، سەرەڕای ئەمەش بەڵگەکانیان لە یەکتر چوون لەوەدا، کە بەڵگەی بەرجەستە بوون، هیچ پێغەمبەرێکیش لە شێوەی قورئانی پێ نەدراوە. (وەرگێڕ).

[2] فتح الباري، إبن حجر، ٧/٩.

بەڵگەی زانستیی قورئان، عەرەب و غەیری عەرەب پەیی پێ دەبەن و دیاردەیەکە تا ڕۆژی دوایی هەردەم لە نوێبوونەوەدایە.

قورئان چەندین هەواڵی تێدایە، کە لە واتا و مەبەستەکانیان تێدەگەین، چونکە بە زمانێکی پاراو و ئاشکرای عەرەبی هاتووە، بەڵام ڕاستییەکان و چۆنێتییەکانیان بەتەواوی دەرناکەوێت، مەگەر دوای ماوەیەک و لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا نەبێت.

وەک خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنْ هُوَ إِلاَّ ذِكْرٌ لِلْعَالَمِينَ(٨٧)وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ(٨٨)﴾ (ص: ٨٧–٨٨). (فراء) لە تەفسیری [حِينٍ] کە لە ئایەتەکەدا باسکراوە، وتوویەتی: "پێش مردن و دوای مردنیش، واتە: تاوەکو ڕاستیی ئەو شتانەتان بۆ دەربکەوێت، کە دەیانڵێم [بَعْدَ حِينٍ] پاش ماوەیەک واتە: لە داهاتوودا"[١].(السدي الكبير) بە هەمان واتا تەفسیری کردووە[٢]. (إبن جرير الطبري)یش دوای باسکردنی چەندین ڕا لە تەفسیری ئەو [حِينٍ]ەی ئایەتەکە باسی لێوە کردووە، وتوویەتی: نزیکترین ڕا لە ڕاستییەوە ئەوەیە بوترێت: "خوای گەورە لە ڕێی قورئانەوە موشریکەکانی ئاگادار کردووەتەوە، کە هەواڵی ڕاست و ڕەوایی قورئان لەمەودوا [بَعْدَ حِينٍ] دەزانن، بەبێ ئەوەی سنوورێکی بۆ ماوەکە [حِينٍ] دیاری کردبێت، لەلای عەرەبیش [حِينٍ] هیچ سنوورێکی دیاریکراوی بۆ دانەنراوە، کە ئیتر لەوە زیاد و کەم نەکات جا ئەگەر مانای [حِينٍ] بەم شێوەیە بێت، ئەوا هیچ ڕایەک لەوە ڕاستتر نییە، کە بەرەهایی بهێڵرێتەوە، هەروەک چۆن خوای گەورە بەرەهایی باسی کردووە، بەبێ ئەوەی تایبەت بکرێت بە کاتێکی دیاریکراوەوە[٣]."

---

[١] القرطبي، ٢٣١/١٥

[٢] أبو حيان، ٤١٢/٧

[٣] الطبري، ١٢١/٢٣

﴿لِكُلِّ نَبَإٍ مُسْتَقَرٌّ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ (الأنعام: ٦٧)، خوای گەورە وەهای ویستووە هەر هەواڵە و کاتێکی دیاریکراوی خۆی بۆ دابنێت، کە تەنیا لەو کاتەدا بێتە دی. ئیتر کاتێک ڕووداوەکە کەوتە بەر چاو، لەم کاتەدا ئەو واتایانەی لە پیت و وشەکانی قورئاندا هاتوون؛ دەدرەوشێنەوە و بەمەش موعجیزەی زانستی بە درێژایی ڕۆژگار نوێ دەبێتەوە، قورئانیش ئاماژەی بۆ ئەم کاتە دیاریکراوە کردووە، وەکو خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿لِكُلِّ نَبَإٍ مُسْتَقَرٌّ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ **(الأنعام: ٦٧)**، هەواڵە خواییەکە بەردەوام هەموو ئەو وێنانە لەخۆ دەگرێت، کە بە درێژایی سەدەکان ئاشکرابوونیان نوێ دەبێتەوە. (إبن جریر الطبري) وتوویەتی: ﴿ لِكُلِّ نَبَإٍ مُسْتَقَرٌّ ﴾ واتە: "هەموو هەواڵێک نیشتگەیەکی خۆی هەیە، بە مانای: نیشتگەیەک تیایدا دەگیرسێتەوە و جێگیر دەبێت و کۆتاییەکی هەیە پێی دەگات، تاوەکو ڕاستی و ڕەوایی هەواڵەکە لە درۆیی و پووچی؛ ڕوون و جیا بێتەوە." ﴿وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ واتە: "ئەی ئەوانەی هەواڵەکانی من بەدرۆ دەخەنەوە! لە ئایندەدا ڕاستیی ئەو شتانەی پێم ڕاگەیاندوون، دەزانن و بۆتان دەردەکەوێت[1]." (إبن کثیر) وتوویەتی: (إبن عباس) و کەسانی تریش وتویانە: "واتە: هەموو هەواڵێک ڕاستییەکی خۆی هەیە، واتە: هەموو هەواڵێک ڕوودانێکی خۆی هەیە، ئەگەر دوای ماوەیەکیش بێت هەر ڕوو دەدات، هەروەک خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ﴾ (ص: ٨٨)". هەروەها فەرموویەتی﴿لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ﴾ واتە: "بۆ هەر وادەیەکی دیاریکراوی هەر شتێک، تۆمارێکی تایبەتی هەیە کە نووسراوە."[2]

زۆربەی زانایانی تەفسیر واتای ﴿لِكُلِّ نَبَإٍ مُسْتَقَرٌّ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾یان بەو جۆرە لێک داوەتەوە کە باسکرا[3].

---

[1] الطبري، ١٤٧/٧

[2] ابن کثیر، ١٤٤/٢

[3] القرطبي: ١١/٧، الشوکاني: ١٢٨/٢، الرازي: ٢٥/٧-٢٦، القاسمي: ٥٧٥/٦، أبو السعود: ١٤٧/٣، البقاعي: ١٤٥/٧-١٤٦.

## هەواڵەکانی زەوی و ئاسمان لە قورئان و سوننەتدا

## لە سەردەمی دۆزینەوەکاندا ئاشکرا دەبن

لە ڕاستیدا هەواڵ و وەسفی شتەکانی ناو زەوی و ئاسمان لە قورئان و سوننەتدا بریتین لە (هەواڵێکی خوایی) دەربارەی ئەو شتانە.

واتە: ئەم هەواڵە لە زاتێکەوە هاتووە، کە لە هەموو کەس زاناترە بەو نهێنییانەی لە زەوی و ئاسماندا دروستی کردوون، وەکو خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿قُلْ أَتُنَبِّئُونَ اللّهَ بِمَا لاَ يَعْلَمُ فِي السَّمَاوَاتِ وَلاَ فِي الأَرْضِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ (یونس: ١٨) واتە: "ئەی (محەمەد – درودی خوای لەسەر) بە خوانەناسان بڵێ: ئایا ئێوە خوای گەورە لە شتێک ئاگادار دەکەنەوە کە لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەبێت و ئەو نەیزانێت؟ خوا پاک و بێگەرد و بڵندە لەوەی کە دەیکەنە هاوبەشی."

باس لە شتەکانی ناو زەوی و ئاسمان، هەواڵدانە سەبارەت بەو شتانەی لە هەردووکیاندان.

قورئان و سوننەت پڕن لە هەواڵ و نهێنییەکانی بوونەوەر، هاوکات زانستەکانی مرۆڤیش لەم سەردەمەی خۆماندا دۆزینەوە دواییەکانی لە ئاسۆکانی زەوی و ئاسماندا لێ هەڵقوڵاوە، لەبەر ئەوە کاتی ئەوە هاتووە، کە ڕاستییەکانی ئەو زانستەی بە نیگا لە قورئان و سوننەتدا دابەزیوە؛ ببینرێن*.

﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت: ٥٣).

دوای ئەوەی ڕۆژگارێکی دوورودرێژ مرۆڤایەتی بە کوێت و پێوەندی چاولێکەریی کوێرانە بەسترابووەوە، وا ئەمڕۆ ئەوەی ڕاگەیاندووە: کە قایل بێت بەوەی زانست بکاتە ڕێگا بۆ ناسینی هەق، لەم پێناوەشدا بینای بۆ زانست

---

* واتە ئەو (حین)ەی ئایەتەکە باسی کردووە ﴿وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ﴾ کاتی هاتووە.

دامەزراندووە و چەندین زانای بۆ خزمەتی خستۆتە کار و پارە و سامانی بۆ دابین کردووە.

جا هەر ئەوەندەی زانستە ئەزموونییەکان توانییان لەسەر پێی خۆیان ڕابوەستن؛ ئیتر دەستبەجێ کەوتنە ئەنجامدانی ئەو پەیامەی خوای گەورە بۆی دیاری کردوون، بەوەی ببنە ڕێگەیەک بۆ باوەڕهێنان بە خوا و ببنە شایەتێک لەسەر ڕاستیی پێغەمبەرەکەی (درووودی خوای لەسەر).

قورئان لە سەردەمێکدا هاتە خوارەوە، کە سەردەمی بڵاوبوونەوەی نەفامی و باوەڕی پڕوپووچ و لافلێدانی پەنهانزانی و جادووگەری و ئەستێرەگەری بوو لە هەموو جیهاندا، عەرەبیش لەم بارودۆخەدا بەشێکی تێروتەسەلی لەم نەفامی و نەزانییە بەر کەوتبوو.

هەروەکو قورئان ئەوەی ڕوون کردووەتەوە:

﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الأُمِّيِّينَ رَسُولاً مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمْ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾(الجمعة:٢)، واتە:"خوای گەورە ئەو زاتەیە، کە لەناو خەڵکێکی نەخوێندەواردا پێغەمبەرێکی لە خۆیان نارد، کە ئایەتەکانی قورئانەکەی ئەویان بەسەردا بخوێنێتەوە و دڵ و دەروون و ڕواڵەت و ئاشکرا و نادیاریان پاکوپوختە بکات و قورئان و فەرموودەی پڕ داناییان تێبگەیەنێت، هەر چەندە ئەوان پێشتر لە گومڕایی و سەرلێشێواوییەکی ئاشکرادا بوون."

هەروەها قورئان بۆ سەر کەسانێک هاتە خوارەوە، کە سەرەتا ڕێگرییان لێکرد و تا ڕادەی خۆبەکوشتدان بەگژیدا چوونەوە، ئەمەش لە پێناوی بەرگری لەو بتانەیان، کە دەستیان لێ هەڵنەدەگرتن و سوور بوون لەسەر پەرستنیان، هەروەها بە هۆی پەیوەستبوونیان بە بیروباوەڕە پڕوپووچەکانی وەک: "جادووگەری و لافوگەزافی پەنهانزانین و ئەستێرەگەری و وەهم و گومانی بەخت

و نیازگرتنەوە بە تیروپشک (أزلام[1]) و ڕەشبینی بەرامبەر بە هەندێ لە مانگەکان و تێپەڕبوونی هەندێ جۆری گیاندار.[3]

هەروەها دەمەقاڵێ و داکۆکییان دەکرد لەو گومڕاییەی، کە دەچوون لە شیو و دۆڵەکاندا داوای پاراستنیان لە شاکانی جنۆکە دەکرد.

ئەمەی باس کرا؛ نموونەیەک بوو لەو گومڕاییەی، کە هزری عەرەبی تێ کەوتبوو، لە کاتی هاتنەخوارەوەی قورئاندا.

عەرەب نەتەوەیەکی نەخوێندەوار بوون، تەنانەت دوای ئەوەش، کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) هانی دان بۆ فێربوونی خوێندنەوە و نووسین و زانست و ژماردن، هیچ کامێک لە ئامرازەکانی نووسینیان لەبەر دەستدا نەبوو، تەنیا پێستە و تەنکەبەرد و لاسکی دارخورما نەبێت، کە لەسەریان دەنووسین[2].

لە سەردەمێکی بەو جۆرە و بۆ سەر نەتەوەیەکی وەها، ئەو نیگایە دابەزیوە، کە زانستی خوای لەخۆ گرتووە و وەسفی نهێنییەکانی دروستکردن لە ئاسۆ جیاجیاکاندا دەکات و وردەکارییەکانی بەدیهێنان لە خودی مرۆڤدا دەردەخات،

---

[1] أزلام: کۆی (زَلَم) یان (زُلَمْ)ە و مانای: تیرێکی بچووکە، کە چاک نەکراوە، واتە پەڕی بۆ دانەنراوە و نووکی تیژی نییە. خەڵکی سەردەمی جاهیلی سێ تیریان هەبوو، لەسەر یەکێکیان نووسیبوو "بیکە" و لەسەر دووەمیان "مەیکە" و سێهەمیشیان هیچیان لەسەر نەنووسیبوو. کاتێک بیانویستایە بڕیار دەربارەی مەسەلەیەک، یان کارێک بدەن لە وێنەی سەفەر و ژنهێنان و چەندین کاروباری تر، ئەم تیرانەیان بەیەکەوە دادەنا و دوای تێکەڵ کردنیان؛ یەکێکیان ڕادەکێشا، ئەگەر ئەوە دەربچووایە، کە لەسەری نووسرابوو (بیکە) کارەکەیان دەکرد، ئەگەر (مەیکە) دەربچووایە؛ وازیان لە کارەکە دەهێنا، خۆ ئەگەر ئەو تیرەش بووایە، کە هیچی لێ نەنووسرابوو، ئەوا سەرلەنوێ کارەکەیان دووبارە دەکردەوە و تێکەڵیان دەکردنەوە و سەرلەنوێ ڕایاندەکێشایەوە تا بە کردن یان بە نەکردن یەکلا دەبووەوە، هەروەها خزمەتکاری (سادن) کەعبە؛ (٧) جۆر لەم تیرانەی لا بووە، کە هەر جۆرەیان بۆ کاروبارێکی دیاریکراو بەکار هێنراوە. بڕوانە تەفسیری ئایەتی (٣)، (٩٠) المائدة لە تەفسیری الجلالین و إبن الکثیر و القرطبي و الطبري. (وەرگێڕ).

[2] کاتێک زۆربەی ئەو کەسانەی قورئانیان لەبەر بوو شەهید کران، پێشەوا ئەبو بەکری سدیق (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمانی کرد بە زەیدی کوڕی سابیت، کە قورئان کۆ بکاتەوە، زەید لەم بارەیەوە دەڵێت: دەگەڕام بەشوێن تۆمارەکانی قورئاندا تاوەکو کۆیان بکەمەوە، کە لە لاسکەکانی دارخورما و تەنکەبەرد و هەروەها لە سنگی پیاواندا بوو -مەبەست ئەوەیە لەبەریان بووە- البخاري/کتاب فضائل القرآن

سەرەتا دەستنیشان دەکات و لە نهێنییەکانی ئێستا دەدوێت و پەنهانەکانی داهاتووی هەموو دروستکراوەکانیش دەخاتە ڕوو.

ئەو دەمەی مرۆڤ ڕۆشتە ناو سەردەمی دۆزینەوە زانستییەکان و توانیی ببێتە خاوەنی وردترین ئامێری توێژینەوەی زانستی و ژمارەیەکی زۆر لە توێژەران، سەرەڕای جیاوازیی ڕەگەزیان، لەلایەنە هەمە چەشنەکان و بوارە جیاجیاکانی توێژینەوەدا کۆ بکاتەوە؛ ئەوانیش دەستیان دایە پشکنین و گەڕان بەدوای نهێنییە شاراوەکان لە ئاسۆکانی زەوی و ئاسمان و بوارە هەمەلایەنەکانی خودی مرۆڤیشدا و لە گەشتێکی درێژخایەندا بە درێژایی سەدەکان خەریکی کۆکردنەوەی پێشەکییەکان و چاودێریی ئاکامەکان بوون...

جا کاتێک لە دەرئەنجامی ئەم هەوڵەدا، وێنەکە تەواو کرا و ڕاستییەکە ئاشکرا بوو، ئا لەم ساتەدا سەرسوڕمێنێکی گەورە و لەناکاو هاتەکایەوە بە دەرکەوتنی ڕووناکییەکانی نیگای خوایی، کە لەپێش هەزار و چوار سەد ساڵ دابەزیوەتە سەر پێغەمبەری خوا (محەمەد - دروودی خوای لەسەر)، ئەمەش بەوەی، کە ئەو (ڕاستییە دۆزراوەیە) لە ئایەتێک یان بەشێکی ئایەتێکدا یان لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر)، یاخود لە بەشێکی فەرموودەیەکدا بە شێوەیەکی وردی زانستییانەی لە ئاسابەدەر و بە کۆمەڵە دەستەواژەیەکی پرشنگدار باسکراوە.

قورئانی پیرۆزیش لەم بارەیەوە هەواڵی پێ داوین، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿**قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ كَانَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ ثُمَّ كَفَرْتُمْ بِهِ مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ(٥٢)سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ(٥٣)**﴾ (فصلت: ٥٢-٥٣). واتە: "ئەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) پێیان بڵێ: هەواڵم بدەنێ ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن خواوە بوو، پاشان ئێوە باوەڕتان پێ نەکرد، ئیتر کێ گومڕاترە لەو کەسەی ڕێگەی جیا و دوور لە ڕاستیی گرتبێتە بەر."

له ئاییندەدا بەڵگە و نیشانەکانی خۆمانیان لە ئاسۆکانی بوونەوەر و لە خودی خۆیاندا نیشان دەدەین، ئەمەش بۆ ئەوەی چاک بۆیان ڕوون ببێتەوە و دڵنیا بن لەوەی ئەم قورئانە ڕەوایە، ئایا ئەوە بەس نییە، کە بێگومان پەروەردگارت بەسەر هەموو شتێکدا ئاگادارە.

دەبا بیر لە هەندێ واتای ئەم دەقە قورئانییە بکەینەوە:

واتای وشەی (الأفق) لە زماندا: (ئەوەی بەدەر کەوتووە لە لاکانی [ئاسۆکانی] گەردوون و لێوارەکانی زەوی).

(آفاق السماء) واتە ئاسۆکانی[1] ئاسمان.

نیشانەکانی خوای گەورە (آیات الله) لە ئاسۆکانی زەوی و ئاسماندا سێ واتا هەڵدەگرێت:

**یەکەم:** ئەو دروستکراوانەی خوای گەورە، کە لە ئاسۆ جیاجیاکانی زەوی و ئاسماندا دروستی کردوون. هەروەک دەفەرموێت: ﴿**وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِنْ دَابَّةٍ وَهُوَ عَلَى جَمْعِهِمْ إِذَا يَشَاءُ قَدِيرٌ**﴾ (الشورى: ٢٩)، واتە: "لە نیشانە و بەڵگەکانی گەورەیی و دەسەڵاتی خوای گەورە، دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و ئەو زیندەوەرانەیە، کە تیایاندا بڵاوی کردوونەتەوە.

**دووەم:** ئەو ئایەتانەی قورئان، کە باس و وەسفی دروستکراوە جۆراوجۆرەکان دەکەن، ئەم ئایەتانەش زۆرن.

**سێیەم:** ئەو بەڵگە و موعجیزانەی ناوبەناو خوای گەورە بۆ سەلماندنی ڕاستگۆیی پێغەمبەرەکەی (دروودی خوای لەسەر) لە ئاسۆ جیاجیاکانی زەوی و

---

[1] بڕوانە: مقاييس اللغة لابن فارس ١/١١٤-١١٥، لسان العرب: ١٠/٥-٦، الصحاح للجوهري: ٤/ ١٤٤٦، تاج العروس: ١/٢٧٩، المفردات للأصفهاني: ١٩.

ئاسماندا دەیانخاتە ڕوو، ئەمەش بە بینینی حەقیقەتی دروستکراوەکان لە واقیعدا بە جۆرێک، کە دەقاودەق لەگەڵ هەواڵەکانی نیگادا یەک دەگرێتەوە[1]

(شەوکاني) لە تەفسیری ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الآفَاقِ﴾ وتوویەتی: "لە ئایندەدا ڕاستیی نیشانەکانیان لەسەر ڕاستی و ڕەوایی قورئان و نیشانەی ئەوەی کە لەلایەن خوای گەورەوەیە، لە ئاسۆکان و لە خودی خۆیاندا نیشان دەدەین..."

واتە: "لە ئایندەدا نیشانەکانی خۆمانیان لە ئاسۆکان و لە خودی خۆیاندا نیشان دەدەین"[2]. (إبن كثير)یش لە بارەی ئەم ئایەتەوە ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ﴾ وتوویەتی: لە داهاتوودا سەلماندنەکان و بەڵگەکانی خۆمانیان بۆ دەردەخەین، لەسەر ئەوەی قورئان ڕەوایە و لەلایەن خواوە نێردراوەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەری خوا (درووودی خوای لەسەر) ئەمەش بە هەندێ بەڵگەی دەرەکی لە ئاسۆکاندا[3]. (زومەخشەری) وتوویەتی: "مانای وەهایە: ئەم بەڵێنە، کە بریتییە لە دەرخستنی نیشانەکانی خوای گەورە لە ئاسۆکان و لە خودی خۆیاندا، لە ئایندەدا دەکەوێتە بەر چاویان و دەیبینن، ئیتر لەو کاتەدا بۆیان ڕوون دەبێتەوە کە قورئان لەلایەن خوای پەنهانزانەوە نێردراوەتە خوارەوە، کە هەر خۆی ئاگاداری هەموو شتێکە و پێیان دەزانێت و دەسەڵاتدارە بەسەریاندا. (پەنهان و ئاشکرا) و (دیار و نادیار)ی هەموو شتێک لای ئەو (خوای گەورە) چوونیەکە، ئەمەشیان بەسە، کە بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی قورئانی پیرۆز ڕەوایە و لەلایەن خواوەیە"[4].

---

[1] واتە: ئەو نهێنییانەی کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بە هۆی پێشکەوتنی زانستەوە لە بوارە جیاجیاکانی دروستکراوەکاندا دەدۆزرێنەوە و ئاشکرا دەبن، ئەو ڕاستییانە دەسەلمێنن کە لە دەقەکانی قورئان و سوننەتدا سەبارەت بەو دروستکراوانە باس کراون. (وەرگێڕ).

[2] فتح القدير، ٤/٥٢٣

[3] تفسير إبن كثير، ٤/١٠٦

[4] الكشاف، ٣/٤٥٨.

زۆرێک لە تەفسیرنووسەکان بەم جۆرە واتای ﴿حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ﴾یان کردووە: (أبوالعباس ابن تيمية) وتوویەتی: "ڕێگەی بینین (الطريق العياني) ئەوەیە: بەندەکان نیشانەکانی (ئاسۆکان و خودی مرۆڤ) ببینن، بە جۆرێک بۆیان ڕۆشن بێتەوە، کە ئەو نیگایەی پێغەمبەران لەلایەن خوای گەورەوە ڕایانگەیاندووە؛ ڕاستە و ڕەوایە.

هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێت: (أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ). واتە: ئایا شایەتیی پەروەردگار بەس نییە، کە شایەتییەکەی هەواڵدانە بەوەی لە زانستی خۆیدایە (واتە زانستی پەروەردگار) کە بریتییە لەو نیگایەی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر) هەواڵی پێداوە، چونکە بەڕاستی خوای گەورە ئاگادار و زانایە بە هەمووَ شتێک".[1] (عطاء) و (ابن زيد) واتای (الآفاق)یان کە لە ئایەتەکەدا هاتووە، بەوە دیاری کردووە، کە (قرطبي) لە تەفسیرەکەیدا لێی گێڕاونەتەوە؛ هەردووکیان وتوویانە: "(في الآفاق) واتە: بەشەکانی ئاسمانەکان و زەوی (أقطار السموات والأرض)، لە خۆر و مانگ و ئەستێرەکان، شەو و ڕۆژ، با و باران، هەورەگرمە و برووسکە و هەورەتریشقە[1]، ڕووەک و درەختەکان، چیاکان و دەریاکان... چەندین شتی تریش".[2] ژمارەیەک لە پێشەوایانی تەفسیر، ئەم تەفسیرەیان لە (عطاء) و (إبن زيد) گێڕاوەتەوە[3]. لە تەفسیری (الجلالين)یشدا هاتووە: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ﴾ بەشەکانی

---

[1] الفتاوى، ١٨٩/١٤.

[1]الرعد: هەورەگرمە، البرق: برووسکە، الصواعق: هەورەتریشقە.

[2] القرطبي، ٣٧٤/١٥، ٣٧٥

[3] بڕوانە: الطبري: ٢٤/٢٥، أبو حيان: ٥٠٥/٧، الخازن في مجموعة من التفاسير: ٣٩٥/٥، الشوكاني: ٥٢٣/٤.

ئاسمانەکان و زەوی لە ئاگر و ڕووەک و درەختەکان. ﴿وَفِي أَنْفُسِهِمْ﴾ لە وردەکاریی دروستکردن و دانایی سەرسوڕهێن لە خودی خۆیاندا[٤].

ئەمانە ئایەتەکانی خوای گەورەن لە پەرتووکەکەیدا، کە باس لە نیشانەکانی خوا دەکەن لە دروستکراوەکانیدا، ئەم ئایەتانە بە هۆی موعجیزەیەکی زانستیی ئاشکراوە دەردەکەون، موعجیزەکەش لە سەردەمی (دۆزینەوە زانستییەکان لە ئاسۆکانی بوونەوەردا) دەدرەوشێتەوە.

---

[٤] الجلالين، ٦٣٨

## بەیەکگەیشتن بێگومانە و موعجیزەکەش هەر ڕوو دەدات

ئێمە لەلایەن خوای گەورە و باڵادەستەوە بەڵێنێکمان پێدراوە بەوەی، کە نیشانەکانی خۆیمان نیشان بدات و بیانبینین. بەم بینینەش؛ زانیاریی ورد و تەواومان سەبارەت بە واتای ئایەتەکان دەست دەکەوێت، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقُلْ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ (النمل: ٩٣)، واتە: "بڵێ سوپاس و ستایش بۆ خوا، لە ئایندەدا بەڵگە و نیشانەکانی خۆیتان نیشان دەدات و ئێوەش دەیانناسنەوە."

دروستکراوەکانی خوای گەورە بەشێکن لە نیشانەکانی خۆی، بەشێکی تریشیان لە قورئاندا بە شێوەی وەسف و هەواڵ هاتوون و باس لە نیشانەکانی خوای گەورە دەکەن لە ئاسمانەکان و زەویدا[1]. (الطبري) لە (ابن أبي نجيح) و(ابن جريج)ەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویانە: (مجاهد) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا وتوویەتی: ﴿سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا﴾ واتە: "لە خودی خۆتاندا و لە ئاسمان و زەوی و ڕۆزیدا[2]." (إبن كثير) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا وتوویەتی: "واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کەس سزا نادات تەنیا دوای ئەوە نەبێت، کە بەڵگەی پێ ڕاگەیاندبێت و پێی سەلماندبێت و ئاگاداری کردبێتەوە، هەر لەبەر ئەمەشە فەرموویەتی: ﴿سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا﴾ هەروەها فەرموویەتی ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ﴾[3].

---

[1] ئەمە لێکدانەوەی وشەی (آیات)ە کە دوو جۆرە، جۆری یەکەم: مەبەست لە (آیات) نیشانەکانی خوایە لە دروستکراوەکاندا، جۆری دووەم: مەبەست لە (آیات) ئایەتەکانی قورئانە کە باس لە دروستکراوەکان دەکەن. بە واتایەکی تر: نیشانە خوێنراوەکان لە (قورئانی پیرۆز)دان کە پەرتووکێکی خوێنراوە (الكتاب المقروء)، نیشانە بینراوەکانیش لە بوونەوەردان کە پەرتووکێکی بینراوە (الكتاب المنظور). (وەرگێڕ).

[2] الطبري، ١٨/٢٠

[3] ابن كثير، ١٨٠/٣

(القرطبي[1]) و (الآلوسي[2]) له تەفسیرەکانیاندا بە هەمان شێوە تەفسیری ئەم ئایەتەیان کردووە. (أبو حيان) لە (البحر المحيط)دا وتوویەتی: (سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ) هەڕەشەیە بۆ دوژمنەکانی بەوەی خوای گەورە نیشانەکانی خۆی نیشانی ئەوان دەدات، ئەوانیش دەیانناسنەوە و ناتوانن خۆیانی لێ هەڵە بکەن و بەناچاری دان بەوەدا دەنێن کە ئەو شتانە نیشانەکانی خوای گەورەن.[3]

هەروەها {آياته} بەوەش مانا کراوە کە بریتین لە: نیشانەکانی خوای گەورە لە خودی خۆتاندا و لە هەموو دروستکراوەکانیدا، کە هەروەکو واتای: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ﴾ وەهایە. هەروەها بە موعجیزەکانی پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر) لێک دراوەتەوە، بەڵام خوای گەورە داویەتیە پاڵ خۆی، لەبەر ئەوەی خۆی هەڵسووڕێنەری موعجیزەکانە لەسەر دەستی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر)، هەر خوای گەورەش لە ڕێی ئەوەوە ئاشکرایان دەکات[3].
(البقاعي)یش لە (نظم الدرر)دا، بە هەمان شێوەی (أبو حيان) تەفسیری کردووە[4].

لە مانەی پێشەوە بۆمان دەردەکەوێت کە مرۆڤایەتی؛ ژووانێکی هەمیشە نوێ و بەڵێنێکی بەردەوامی هەیە لەلایەن خواوە، بەوەی کە خوای گەورە نیشانەکانی خۆی لە بوونەوەر و لە پەرتووکەکەیدا (قورئانی پیرۆز) ئاشکرا بکات و بیانخاتە بەر چاو، تاوەکو بەڵگەی خۆی بچەسپێنێت و موعجیزەکەش دەربکەوێت.

نیگای خوایی لە قورئان و سوننەتدا پڕە لە هەواڵ دەربارەی باس و وەسفی دروستکراوەکان، ئەمە لە لایەک، لە لایەکی دیکەوە توێژینەوە زانستییە ئەزموونییەکان لێکۆڵینەوە و گەڕانەکانی خۆیان ئاڕاستەی هەمان گۆڕەپان کردووە، کە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) لێی دواون.

---

[1] القرطبي، ٢٤٦/١٣
[2] الآلوسي، ٤٠/٢٠
[3] أبو حيان، ١٠٣/٧
[4] البقاعي، ٢٢٩/١٤-٢٣٠

کەوابوو بەیەکگەیشتن لە نێوانیاندا شتێکی حەتمییە و بێگومان موعجیزەکەش هەر ڕوو دەدات. زانستە ئەزموونییەکانی مرۆڤ سەلماندوویانە، کە هەواڵدانی قورئان سەبارەت بە دەستکاریکردن و شێواندنی ئایینەکانی تر[1]، ڕاستە و تەواوە.

هەروەک چۆن ئەم زانستانە بوون بە شایەتیدەر و ڕۆشنکەرەوە بۆ وردەکاریی واتای ئەو ئایەت و فەرموودانەی کە پەیوەندییان بە مەسەلەکانی بوونەوەرەوە هەیە. وەتا بانگخوازانی ئیسلام لە پسپۆڕییە زانستییە جیاوازەکاندا لە پێشبڕکێدان بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم موعجیزە زانستییانە، هەروەک چۆن ژمارەیەک لە گەورەزانایانی بوونەوەر لە غەیری مسوڵمانان ڕوویان کردووەتە هەمان گۆڕەپان[2]، کە هەندێکیان مسوڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیاندووە[3]، هەندێکی تریشیان شایەتییان داوە لەسەر ڕاستیی موعجیزەی زانستی، ئەمەش وەهای کردووە، کاتی ئەوە هاتبێت واتای زۆرێک لە ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) کە باس لە بوونەوەر دەکەن؛ ئاشکرا بێت و ڕۆشن بێتەوە: ﴿لِكُلِّ نَبَإٍ مُسْتَقَرٌّ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ (الأنعام: ٦٧).

جا ئەگەر هەندێک لە توێژینەوەکانی بواری ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا کەموکوڕییان تێدا بێت؛ ئەمە نابێتە بەهانە بۆ ئەوەی حوکمی ناتەواوی بدرێت بەسەر هەموو توێژینەوەکاندا، بەڵکو ئەمە وەها پێویست دەکات لەسەر ئەو زانایانەی ئیسلام کە بەتوانا و لێهاتوون، دەستپێشخەری بکەن بۆ

---

[1] بڕوانە ئەو پەرتووکەی پزیشکی فەرەنسی بەناوبانگ (مۆریس بۆکای) بە ناونیشانی (التوراة والإنجيل والقرآن في ضوء المعارف العلمية الحديثة) دایناوە، تیایدا سەلماندوویەتی کە تەورات و ئینجیل دەستکاری کراون و لەگەڵ ڕاستییەکانی زانستدا دژی یەکن، بەڵام قورئان دوورە لە دەستکاریکردن و بگرە پێش زانستە نوێیەکانیش کەوتووە.

[2] بڕوانە ئەو توێژینەوانەی حەوت لە گەورەزانایانی کۆرپەلەزانی و توێکاری و نەخۆشییەکانی ژنان لە غەیری مسوڵمانان بەشدارییان تێدا کردووە، لە لیژنەی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا، لە کۆنگرەی هەشتەمی پزیشکیی سعودی کە لە هۆڵی گەورەی شاری ریاز لە (محرم)ی ساڵی (١٤٠٤ک) بەسترا.

[3] لە نموونەی: پرۆفیسۆر (تاجاتات تاجاسن) کە لە کۆتایی توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستیدا لەناو هۆڵی کۆنگرەی هەشتەمی پزیشکیی سعودیدا، مسوڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند.

خزمەتكردنی قورئان و سوننەت لە بواری زانستەكانی بوونەوەردا، هەروەک چۆن پێشینان لە بواری زمان و ئوسوڵ و فیقهـ و بوارەكانی تری زانستە شەرعییەكاندا خزمەتیان كردوون، چونكە ئێمە لەبەردەم موعجیزەیەكی زانستیی هێندە گەورەداین كە سەركردە بەویژدانەكانی زانستەكانی بوونەوەر لەم سەردەمەدا تەوێڵیان لە ئاستیدا دادەنەوێنن.

لە ڕاستیشدا ئەو جۆرە تەفسیرەی زانا مسوڵمانەكان دەیزانن -ئەوانەیان كە ئاگاداری نهێنیی دروستكراوەكانن-، جەختكردنە لە ئیعجازی زانستی.

هەروەک ئەم ئایەتە پیرۆزانە ئاماژەیان پێ كردووە: ﴿إِنَّ اللَّهَ فَالِقُ الْحَبِّ وَالنَّوَى يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنْ الْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ الْمَيِّتِ مِنْ الْحَيِّ ذَلِكُمْ اللَّهُ فَأَنَّا تُؤْفَكُونَ(٩٥)فَالِقُ الإِصْبَاحِ وَجَعَلَ اللَّيْلَ سَكَنًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ حُسْبَانًا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ(٩٦)وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ النُّجُومَ لِتَهْتَدُوا بِهَا فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ قَدْ فَصَّلْنَا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ(٩٧)﴾ (الأنعام: ٩٥-٩٧)، واتە: "بەڕاستی خوا لەتكەری دانەوێڵە و ناوكە تۆوە، زیندووش لە مردوو دەردەهێنێت و دەرهێنەری مردووشە لە زیندوو، ئەوەیە خوای پەروەردگارتان، دەی كەواتە چۆن (لە ناسین و پەرستنی ئەو خوایە) لا دەدرێن و وێڵ دەكرێن، هەر ئەو زاتەیە، كە بەیانیان فەراهەم دەهێنێت و ئاسۆ ڕووناک دەكاتەوە و شەوی كردووە بە هۆی ئارامی و خامۆشی، خۆر و مانگیش بۆ زانینی حسابكردن و دیاریكردنی كات، ئەو شتانەش هەمووی ئەندازەگرتنی خوای بەدەسەڵاتی زانایە، هەر خوایە ئەستێرەی داناوە بۆتان تا ببێتە ڕێنیشاندەرتان و لە ناو تاریكییەكانی وشكانی و دەریادا ڕێیان پێ دەركەن، بەڕاستی ئێمە نیشانە و بەڵگەكانمان ڕوون كردووەتەوە بۆ كەسانێک كە بزانن و تێبگەن." ﴿قَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ واتە: "ئایەتەكانی قورئان بزانن و هەروەها ئایەتەكانی (نیشانەكانی) بوونەوەریش."

سەرەڕای ئەوەی ئەم جۆرە تەفسیرە ئیعجازی زانستی دووپات دەكاتەوە، بەڵام دەبێت بزانین كە تەفسیری زانستی و ئیعجازی زانستی؛ یەک شت نین و جیاوازن.

## جیاوازیی نێوان تەفسیری زانستی و ئیعجازی زانستی

**تەفسیری زانستی:** بریتییە لە: ڕوونکردنەوەی واتای ئایەت، یان فەرموودە لەبەر ڕۆشنایی ئەو بابەتانەی کە لەنێو بیردۆزەکانی زانستەکانی بوونەوەردا لایەنی ڕاستبوونیان پارسەنگ بووە.

بەڵام **ئیعجازی زانستی:** بریتییە لەوەی کە قورئانی پیرۆز، یان سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) دەربارەی ڕاستییەک هەواڵیان دابێت، کە زانستی ئەزموونی بۆ دواجار سەلماندوویەتی و چەسپاویشە، کە لە تواناداا نەبووە بە ئامڕازە مرۆییەکانی سەردەمی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) درکی پێ بکرێت[1]. بەم شێوەیە دەردەکەوێت قورئان، یان فەرموودە ئەو ڕاستییانەی بوونەوەریان لەخۆ گرتووە، کە دواجار واتای ئایەتەکە یان فەرموودەکەی پێ شی دەکرێتەوە، خەڵکیش ڕاستییە سەلمێنراوەکەی لە بوونەوەردا دەبینن و بەمەش تەفسیرەکەی جێگیر دەبێت و واتاکەشی بەتەواوی دەزانرێت، هەروەک خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لِكُلِّ نَبَإٍ مُسْتَقَرٌّ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ (الأنعام: ٦٧).

پێدەچێت بە درێژایی سەدەکانیش چەندین دیمەنی تری ڕەگەزەکانی بوونەوەر ئاشکرا ببن، کە واتا جێگیربووەکە زیاتر دەربخات و پتر قووڵ و گشتگیری بکات، چونکە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر) تایبەتمەندە بەوەی کە وشە پڕ واتاکانی (جوامع الكلم) پێ بەخشراوە[2]، بەمەش ئیعجازەکە قووڵتر و گشتگیرتر دەبێت. هەروەها ئەو دەستوورەی بوونەوەریش (السنة الكونية) زیاتر ڕوون دەبێتەوە، بە هۆی ئەوەی کە زۆر دیمەنە بەڵگەی تر دێنە ناو چوارچێوەی ئەمەوە و هەمان حوکمی ئەم وەردەگرن.

---

[1] ئەمەش خۆی لە خۆیدا مانای (تحدي)ی تێدایە، کە کەس ناتوانێت کاری لەو جۆرە بکات.

[2] بڕوانە فتح الباري، ٢٤٧/١٣

## سەرچاوەکانی توێژینەوەی ئیعجازی زانستی

بەو پێیەی توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستی، پەیوەندییان بە تەفسیر و ڕاڤەی ئەو ئایەت و فەرموودانەوە هەیە، کە باس لە بوونەوەر دەکەن، لەبەر ئەوە ئەم توێژینەوانە دەبن بە لقێک لە لقەکانی تەفسیری قورئان و بە بەشێک لە ڕاڤەی فەرموودە و پشت بە سەرچاوەکانی هەردوو زانستی تەفسیری قورئان و زانستی فەرموودە دەبەستن، ئەمە لە لایەک، لە لایەکی تریشەوە، لەبەر ئەوەی کاری ئەم توێژینەوانە بریتییە لە دەرخستنی گونجاوی و کۆکبوونی (توافق) نێوان دەقەکانی نیگا و ئەو ڕاستی و نهێنییانەی بوونەوەر، کە زانستی ئەزموونی ئاشکرای کردوون، ئەوا لەم ڕووەیانەوە توێژینەوەکان پشت بە سەرچاوەکانی زانستە ئەزموونییەکان دەبەستن و لە هەمان کاتیشدا پێویستیان بە مێژووی زانستە ئەزموونییەکان دەبێت.

لەگەڵ ئەمانەشدا توێژینەوەکان پەیوەندییشیان بە (زانستی بنەماکانی ئایین: علم أصول الدين)ەوە هەیە[1].

---

[1] دەتوانرێت سەرچاوەکانی (توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستی) بەم جۆرە دیاری بکرێت:

١.سەرچاوەکانی زانستی تەفسیری قورئان

٢.سەرچاوەکانی زانستی فەرموودە

٣.سەرچاوەکانی زانستە ئەزموونییەکان

٤.مێژووی زانستە ئەزموونییەکان

٥.زانستی بنەڕەتەکانی ئایین (علم أصول الدين) (وەرگێڕ)

# ڕێساکانی توێژینەوەی ئیعجازی زانستی

توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستی لەسەر کۆمەڵە ڕێسایەک بنیات نراون، کە لەم خاڵانەی خوارەوەدا بە کورتی و پوختی باسیان دەکەین:

أ. زانستی خوای گەورە، زانستێکی کۆگیر و گشتگیرە و هەرگیز هەڵەی تیا نییە و بە هیچ جۆرێک ناتەواوی ڕووی تێ ناکات، بەڵام زانستی مرۆڤ سنووردارە و شیاوی زیادبوونە و ڕووبەڕووی هەڵەش دەبێتەوە.

ب. دەقەکانی نیگا هەندێکیان واتاکانیان بڕاوەن (قطعي[1])ن، هەروەها ڕاستییە زانستییەکانی بوونەوەریش هەندێکیان بڕاوەن (قطعي)ن.

ج. هەندێک لە دەقەکانی نیگا واتاکانیان (ظني[2])ن، لە زانستیشدا هەندێک لە بیردۆزەکان بەتەواوی نەسەلمێنراون و لە پلەی (ظني)دان.

د. هەرگیز ناگونجێت دژایەتی لە نێوان دەقێکی(قطعي)ی نیگا و ڕاستییەکی (قطعي)ی زانستی ئەزموونیدا ڕوو بدات.

ئەگەر دژیەکییەکی دیار کەوتە نێوانیانەوە، کە وابوو هەڵەیەک هەیە لە بە (قطعي) دانانی یەکێکیاندا[3].

هـ. کاتێک خوای گەورە یەکێک لە نیشانەکانی خۆی لە ئاسۆکانی بوونەوەردا، یان لە خودی مرۆڤەکاندا نیشانی بەندەکانی دەدات، بە جۆرێکی وا ڕاستیی ئایەتێکی قورئان یان فەرموودەیەکی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) دەربخات و بیسەلمێنێت، ئا لەم کاتەدا بە هۆی ئاشکرابوونی ڕاستییە زانستییەکانەوە؛

---

[1] قطعي الدلالة: مەبەست لەو دەقەیە کە تەنیا یەک واتای دیاریکراو دەبەخشێت و واتاکەی یەکلا کراوەتەوە و ساغ بووەتەوە.

[2] ظني الدلالة: مەبەست لەو دەقەیە کە چەند واتایەک هەڵدەگرێت و بەتەواوی بەسەر یەک ماناذا دانەبڕاوە.

[3] ئەم ڕێسایە، ڕێسایەکی گەورەیە و زانایانی ئیسلام بڕیاریان لەسەر داوە و (أبو العباس ابن تيمية) پەرتووکێکی (١١) یانزە بەرگیی بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم ڕێسایە داناوە بە ناونیشانی (درء تعارض العقل والنقل).

مانایەکی تری نوێ لە ماناکانی تەفسیری قورئان و ڕاڤەی فەرموودە ڕوون دەبنەوە.

و. دەقەکانی نیگا بە کۆمەڵە وشەیەکی کۆگیر[1] دابەزێنراون، کە هەموو واتا ڕاستەکانی ئەو بابەتانەی لە بارەیانەوە هاتوون؛ لەخۆ دەگرن، ئەم واتایانەش ناوبەناو بەدوای یەکدا ئاشکرا دەبن و نەوە بە نەوە دەبینرێن*.

ز. ئەگەر دژیەکییەک لەنێوان واتایەکی (قطعي)ی دەقێک و بیردۆزێکی زانستیدا دەرکەوت؛ ئەوا بیردۆزەکە ڕەت دەکرێتەوە، چونکە دەقەکە نیگایە و لە زاتێکەوە هاتووە کە هەموو شتێک دەزانێت و هیچی لێ ون نابێت، ئەگەر لەگەڵ یەکیشدا گونجان؛ ئەوا لەم کاتەدا دەقەکە دەبێت بە بەڵگە لەسەر ڕاستیی بیردۆزەکە.

ح. ئەگەر دژیەکی کەوتە نێوان ڕاستییەکی زانستیی (قطعي) و فەرموودەیەک لە جۆری (ظني الثبوت)، ئەوا لەم کاتەدا فەرموودە (ظني)یەکە بەو جۆرە لێک دەدرێتەوە کە لەگەڵ ڕاستییە (قطعي)یەکەدا بگونجێت، خۆ ئەگەر هیچ بواری گونجاندن نەبوو، ئەوا (قطعي) یەکە پێش دەخرێت.

---

[1] پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر) فەرموویەتی: ((بعثت بجوامع الكلم))، (البخاري) لە بەشی (الجهاد)دا و (مسلم) لە (المساجد)دا بە ژمارە ٤٥٢٣ و (الترمذي) لە (السير)دا بە ژمارە ١٥٥٣ و (النسائي) لە بەشی (الجهاد، باب وجوب الجهاد)دا گێڕاویانەتەوە. واتە: "من بە کۆمەڵە گوتە یان وشەگەلێکی کۆگیر ڕەوانە کراوم".

(إبن حجر) لە (فتح الباري)دا (٢٧٤/١٣) وتوویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر) قسەکانی کورت و پوخت بوون، چەند وشەیەکی کەم بوون، بەڵام واتایەکی زۆریان بەخشیوە. هەروەها لە (البخاري) دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: وەکو لە بارەی (جوامع الكلم)وە پێم گەیشتووە، بریتییە لەوەی: خوای گەورە کۆمەڵێک شتی زۆر کە لە پەرتووکەکانی پێش پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر) تۆمار کراون، لە یەک یان دوو مەسەلەدا کۆ کردووەتەوە .

* واتە مەرج نییە هەموو واتاکان یان ڕاستییەکان لە یەک سەردەمدا بە یەک جار دەربکەون.

## ڕووەکانی ئیعجازی زانستی

موعجیزەی زانستی قورئان، لە هەموو بوارەکانی زانست و لەبەردەم کەسانی تایبەتمەند و خاوەن زانستدا دەردەکەوێت.

ئەم موعجیزە زانستییەی قورئان بەڕوونی لە شێوازی داڕشتن و هەواڵدانی دەربارەی پێشینان و ڕووداوەکانی ئایندە و حیکمەتەکانی یاسادانان و... چەندین بواری تردا دیارە.

بەڵام زاراوەی "ئیعجازی زانستی" کە لەم سەردەمەدا بڵاو بووەتەوە، بەسەر ئەو ڕووانەی ئیعجازی زانستی قورئان و سوننەتدا دابڕاوە، کە زانستەکانی بوونەوەر و زانستی پزیشکی دۆزیویانەتەوە.

هەر کەسێک لە بارودۆخی جیهان -لەپێش هاتنەخوارەوەی قورئان- ورد بێتەوە؛ بۆی دەردەکەوێت ئەو دەمە دواکەوتنێکی یەکجار گەورە لە بواری زانستەکانی بوونەوەردا هەبووە، هەروەها ئەوە بەدی دەکرێت کە چۆن زانیارییەکانی مرۆڤ سەبارەت بە بوونەوەر تێکەڵ بە جادووگەری و لافی پەنهانزانی و وەهم بووە، بە ڕادەیەک کە بیروباوەڕی پڕوپووچ و ئەفسانەکان زاڵ بوون بەسەر بیری مرۆڤایەتیدا.

دوای هاتنەخوارەوەی قورئانیش؛ مرۆڤایەتی ماوەیەکی دوورودرێژ لە چاوەڕوانیدا بوو، پێش ئەوەی ببێت بە خاوەنی ئامرازگەلێکی زانستیی وەها، کە بە هۆیانەوە نهێنییەکانی بوونەوەر بدۆزێتەوە.

کاتێکیش ئەو شتانەی توێژەران دوای گەڕان و لێکۆڵینەوەی درێژخایەن و بە بەکارهێنانی وردترین ئامێری نوێ، ڕێیان لێ کەوت و دۆزییانەوە، تەماشا کرا لەملاوە هەمان ئەو شتانە لە ئایەتێک، یان فەرموودەیەکدا، لەپێش هەزار و چوار سەد ساڵەوە باسکراون و لە دووتوێی ڕاستییەکانی نێو نیگادا خراونەتە ڕوو.

لە ڕاستیدا ئەو عەرەبانەی، کە قورئان ڕووی ئایەتەکانی تێ کردوون و ئاخاوتنی لەگەڵ کردوون؛ پێویستیان بەوە نەبووە ئەو هەموو وەسف و هەواڵە

زۆرەیان ئاراستە بکرێت، کە لە قورئان و سوننەتدا دەربارەی بوونەوەر و نهێنییەکانی باسکراون، لە پێناوی ئەوەی ڕاستگۆیی پێغەمبەریان (دروودی خوای لەسەر) بۆ بسەلمێت، بەڵکو بوونی ئەم جۆرە وەسف و هەواڵانە ئەوە دووپات دەکاتەوە، کە قورئان و سوننەت بریتین لەو نیگا دەستەوسانکەرەی کە بەڵگەی ڕاستێتی خۆی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە بۆ سەرجەم مرۆڤەکان، لە سەردەمە جیاجیاکان و قۆناغە جۆراوجۆرەکانیاندا.

هەروەک (أبوالعباس ابن تيمية) لە وەسفی قورئاندا باسی کردووە:

"بەڕاستی چەندین نیشانە و بەڵگە لە قورئاندا کۆ بوونەتەوە، کە لە غەیری ئەودا کۆ نەبوونەتەوە، چونکە قورئان هەر خۆی بانگەوازیشە و بەڵگەشە، سەلماندنیشە و سەلمێنراویشە، هەروەها بەهانەیە لەسەر داواکاری و داخوازی و شایەتیدەر و شایەتی بۆ دراویشە[1]".

**ڕووەکانی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا، لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەردەکەوێت:**

١. بەیەکگەیشتن و کۆکبوونی ورد و تەواو لە نێوان ئەو باسانەی لە دەقەکانی قورئان و سوننەتدا هەن، لەگەڵ ئەو ڕاستییانەی بوونەوەر و نهێنییە زانستییانەی زانایانی بوونەوەر دۆزیویانەتەوە[2]، کە لە توانای هیچ مرۆڤێکدا نەبووە لە کاتی هاتنەخوارەوەی قورئاندا بیانزانێت.

---

[1] الفتاوی، ١٤/ ١٩٠.

[2] پرۆفیسۆر (کیث ل. مور) -کە یەکێکە لە بەناوبانگترین زانایانی جیهان لە زانستی کۆرپەلەزانیدا، پەرتووکەکەشی دەربارەی کۆرپەلەزانی؛ سەرچاوەیەکی جیهانییە و وەرگێردراوە بۆ حەوت زمان، لەوانە: زمانی ڕووسی و یابانی و ئەڵمانی و چینی- دوای ئەوەی قایل بوو بە توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستی؛ موحازەرەیەکی بە ناونیشانی "وەک یەک بوونی –مطابقة- زانستی کۆرپەلەزانی لەگەڵ ئەوەی لە قورئان و سوننەتدا باس کراوە" لە سێ کۆلێژی پزیشکی لە سعودیە لە ساڵی (١٤٠٤ک) دا پێشکەش کرد.

٢. دەقەکانی قورئان و سوننەت بوون بە مایەی ڕاستکردنەوەی ئەو بیروڕا پووچانەی سەبارەت بە نهێنییەکانی دروستکردن[١] بە درێژایی نەوە جیاجیاکان لەناو مرۆڤایەتیدا بڵاو ببوونەوە، ئەمەش تەنیا بە زانستی ئەو زاتە نەبێت، کە ئاگای لە هەموو شتێکە؛ نایەتە دی.

٣. سەرەڕای ئەوەی دەقەکانی قورئانی پیرۆز و سوننەتی ڕاست و ڕەوانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) لە یەککات و لە یەک شوێندا دانەبەزیون و ئایەتەکانیش لە چەندین جێگەی جیاجیادان لە قورئاندا، بەڵام کاتێک کۆیان دەکەیتەوە بۆت دەردەکەوێت کە هەریەکێکیان تەواوکەری ئەوی ترە، بە هەمووشیان هەقیقەتێک ئاشکرا دەکەن، ئەمەش تەنیا و تەنیا کاربەجێیی خوای گەورەیە کە نهێنییەکانی ئاسمانەکان و زەوی دەزانێت.

٤. داڕشتنی کۆمەڵە یاسایەکی پڕ لە حیکمەت، کە لەوانەیە لە کاتی هاتنەخوارەوەی قورئاندا حیکمەتەکان شاراوە بووبن و خەڵکی نەیانتوانیبێت دەرکی پێ بکەن، بەڵام توێژینەوەکانی زانایان لە بوارە جیاجیاکاندا دەبنە هۆی دەرخستنیان و ئاشکرابوونیان[٢].

٥. نەبوونی هیچ جۆرە دژیەکییەک لەنێوان ئەو دەقە (قطعي)یە زۆرانەی نیگادا، کە باس لە بوونەوەر و نهێنییەکانی دەکەن و ئەو ڕاستییە زانستییە

---

[١] وەکو ئەو ڕایە پووچەڵەی لە کۆندا لەنێوان زانایانی توێکاریدا بڵاو ببووەوە کە گوایە کۆرپەلە لە خوێنی حەیز دروست دەبێت، ئەم بیروباوەڕە بەردەوام بوو تا لە سەدەی (١٦)ی زایینیدا وردبین (مایکۆسکۆب) دۆزرایەوە، بەڵام دەقەکانی قورئان و سوننەت بە چەندین سەدە پێش دۆزینەوەی وردبین ئەوەیان سەلماندووە، کە کۆرپەلە لە مەنی دروست دەبێت. (ابن القیم) و (ابن حجر) و چەندانی تر لە زانایانی مسوڵمان، بە هۆی دەقەکانی نیگاوە ئەم قسانەی زانایانی توێکاریی سەردەمی خۆیانیان ڕەت کردووەتەوە.

(ابن حجر) لە (فتح الباري)دا (٤٨٠/١١) وتوویەتی: زۆرێک لە توێکاران وایان داناوە، کە (مەنی)ی پیاو هیچ کاریگەرییەکی نییە لە دروستبوونی کۆرپەلەدا تەنیا لە هەڵپێچانیدا نەبێت و پێیان وایە کۆرپەلە لە خوێنی حەیز دروست دەبێت، بەڵام فەرموودەکانی ئەم بەشە ئەم ڕایە پووچەڵ دەکەنەوە.

[٢] بۆ نموونە: زانستی نوێ هەندێک لە حیکمەتەکانی (حەرامکردنی خواردنی گۆشتی بەراز)ی دەرخستووە.

زۆرانەی دۆزراوونەتەوە، لە کاتێکدا کە دژیەکیی زۆر هەن لە نێوان ئەو بیردۆزانەدا، کە زانایانی بوونەوەر باسیان دەکەن و هاوکات لەگەڵ پێشکەوتنی دۆزینەوەکاندا دەگۆڕێن، ئەمە لە لایەک، لە لایەکی تریشەوە، دژیەکی هەیە لەنێوان زانست و ئەو شتانەدا کە ئایینە شێوێنراو و دەستکاریکراوەکان باسیان لێ کردوون.

وەکو خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا كُنْتَ تَتْلُو مِنْ قَبْلِهِ مِنْ كِتَابٍ وَلاَ تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذًا لاَرْتَابَ الْمُبْطِلُونَ(٤٨)بَلْ هُوَ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ فِي صُدُورِ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلاَّ الظَّالِمُونَ(٤٩)وَقَالُوا لَوْلاَ أُنْزِلَ عَلَيْهِ آيَاتٌ مِنْ رَبِّهِ قُلْ إِنَّمَا الآيَاتُ عِنْدَ اللَّهِ وَإِنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُبِينٌ(٥٠)أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّا أَنْزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ يُتْلَى عَلَيْهِمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَى لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ(٥١)قُلْ كَفَى بِاللَّهِ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ شَهِيدًا يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَالَّذِينَ آمَنُوا بِالْبَاطِلِ وَكَفَرُوا بِاللَّهِ أُوْلَئِكَ هُمْ الْخَاسِرُونَ(٥٢)﴾ (العنكبوت: ٤٨–٥٢)، واتە: "تۆ ئەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر)، پێش ئەم قورئانە هیچ کتێبێکت نەدەخوێندەوە، بە دەستی خۆیشت هیچ نووسینێکت نەنووسیوە، ئەگەر وا بووایە؛ ئەوا ئەو کاتە ناڕاستەکان (بێبڕوایان) دەکەوتنە گومانەوە (کە گوایە قورئان لە دانان و داڕشتنی تۆیە)(٤٨)، (نەخێر وا نییە کە گومان دەبەن)، بەڵکو قورئان چەند ئایەتێکی ڕوون و ئاشکران لە سینە و دڵ و دەروونی ئەو کەسانەدا، کە لەلایەن خواوە زانستیان پێ بەخشراوە و لەبەریانە، بەڕاستی جگە لە ستەمکاران؛ کەس بەرهەڵستی و نکوڵیی لە ئایەتەکانی ئێمە نییە و تەنیا ئەوان دانی پێدا نانێن(٤٩)، بێباوەڕان دەڵێن: ئەوە بۆچی چەندین نیشانە و بەڵگەی لەلایەن پەروەردگارییەوە بۆ دانابەزێنرێت، تۆش لە وەڵامیاندا بڵێ: موعجیزە و بەڵگەکان تەنیا لەلایەن خواوەیە، من تەنیا بێدارکەرەوەیەکی ئاشکرام بۆتان(٥٠)، ئایا بەس نییە بۆ ئەوان، کە ئێمە قورئانمان ناردووەتە خوارەوە بۆ سەر تۆ و بەسەریاندا دەخوێنرێتەوە،

بێگومان لەم قورئانەدا بەزەیی و یادهێنانەوە و پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆ ئەو کەسانەی ئیمان دەهێنن(٥١)، پێیان بڵێ: تەنیا خوا بەسە شایەت بێت لە نێوان من و ئێوەدا، ئەو خوایەی هەر چی لە ئاسمانەکان و زەویدایە دەیزانێت و ئەوانەش باوەڕیان بە ناحەق و بەتاڵ هێناوە و بێباوەڕ بوون بە خوای گەورە، تەنیا هەر ئەوانەن زەرەرمەندان(٥٢).."

<u>سەرنجێک:</u> باسەکەی ئێمە لێرەدا تەنیا تایبەتە بە مەسەلەکانی ئیعجازی زانستی، کە دەقەکان کۆمەڵە واتایەک دەخەنە ڕوو سەبارەت بە چۆنێتی و وردەکارییە نوێیەکان، کە بە درێژایی سەردەمەکان ئاشکرا دەبن، بەڵام ئەو دەقانەی پەیوەندییان بە بوارەکانی بیروباوەڕ و پەرستش و مامەڵە و ڕەوشتەوە هەیە، هەموو ئەوانە پێغەمبەری خوا (درووودی خوای لەسەر) ڕووونی کردوونەتەوە و تەفسیرەکانیان ڕۆشن بووەتەوە[1].

---

[1] التفسير والمفسرون للذهبي، ٣٤/١

## توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستی

## لەبەر ڕۆشنایی بەرنامەی پێشینان و قسەی زانایانی تەفسیردا

پێشینان خاوەنی بەرنامەیەکی ڕاست و ڕەوانن لە بواری مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو شتە پەنهانانەی نیگا باسی لێوە کردوون، بەتایبەت ئەو باسانەی پەیوەندییان بە سیفەتەکانی خوای گەورە و بارودۆخەکانی ڕۆژی دوایی و هەر بابەتێکی تر، کە لە ڕێی نیگاوە نەبێت؛ پەی پێ نابرێت.

بەرنامەکەشیان بریتییە لە: ڕاوەستان لەو ڕادەیەدا، کە واتای دەقەکان دەیبەخشن، بەبێ زۆرلەخۆکردن بۆ زانینی چۆنێتییەکان و ئەو وردەکارییانەی کە نیگا ڕوونی نەکردوونەتەوە، چونکە گەڕان لەم بوارەدا وەکو گەڕانە بەناو تاریکیدا، هەوڵدانیش بۆ زانینی شتانێک زیاد لەوەی، کە نیگا ئاشکرای کردوون؛ بریتی دەبێت لە: بەزۆر چەسپاندنی ڕاستییە گەورەکانی نیگا، لەناو قاڵبی ئەو بیروبۆچوونە مرۆییە سنووردارانەی بە هەریەک لە سنوورەکانی هەست و کات و شوێن -کە چواردەوری مرۆڤیان گرتووەتەوە-؛ دیاری کراوە.

فەرموودەکانی خوای بەدیهێنەری پاک و بێگەرد دەربارەی نهێنیی دروستکراوەکانی لە ئاسۆکان و لە خودی مرۆڤەکانیشدا، بەر لەوەی خوای گەورە تەواوی ڕاستییەکانی ئەم نهێنییانەمان نیشان بدات؛ -ئەم فەرموودانە- شتێکی پەنهانن. هەروەها بەر لە بینینیان؛ هیچ ڕێگەیەک نییە بۆ زانینی چۆنێتییەکان و وردەکارییەکانی ئەو نهێنییانە، تەنیا ئەوە نەبێت، کە لە ڕێی نیگاوە بیستوومانە. هەر لەبەر ئەمەشە پێشینان زۆریان لە خۆیان نەدەکرد بۆ باسکردنی شتانێک، کە زانستیان لە بارەیەوە نەبووبێت و بەو ڕادەیە لێی دواون، کە لە نیگاوە لێی تێگەیشتوون.

لە ڕاستیدا واتای ئەو ئایەتانەی پەیوەندن بە شتە پەنهانەکانەوە لە ڕووی زمانەوە زانراون، بەڵام چۆنێتییەکان و وردەکارییەکانیان شاراوەن.

بەگوێرەی ئەمەش، باسکردنی ڕاستییەکانی بوونەوەر -کە لە نیگادا هاتوون- لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت؛ جا کاتێک کەسێک دێت و -لەدوای

ئەوەی، کە خوای گەورە ڕاستییەکانی ئاشکرا کردووە و خستوویەتیە بەر چاوان- بە وردەکاریی تەواو و هەمەلایەنەوە باسیان دەکات؛ بێگومان باسکردنی ئەم کەسە جیاوازە لە باسکردنی ئەو کەسەی تەنیا لە ڕێی دەقێکی بیستراوەوە لێیان دەدوێت، بەبێ ئەوەی واتاکەی لە واقیعدا کەوتبێتە بەر چاو، چونکە باس و وەسفی کەسێک، کە بە بیستن و بینین ئاگادار بووبێت؛ جیاوازە لە وەسفی کەسێکی تر کە تەنیا بە هۆی بیستنەوە شتەکان بزانێت.

نموونەی ئەم دووانە وەکو حاڵی دوو کەس وایە، کە خاوەنی کتێبخانەیەکی گەورە باسی کتێبخانەکەی خۆییان بۆ بکات، لە کاتی باسکردنەکەشیدا بەشێکی کتێبخانەکەیان لەبەر چاودا بێت و بەشەکەی تریشی -لەبەر بوونی هەندێ پەردە و تاریکیی شوێنەکە- نەبینرێت و لێیانەوە دیار نەبێت.

یەکێکیان -لەبەر هەر هۆیەک بێت- توانای ئەوەی نەبووە پەردەکان لا بەرێت و بەشە تاریکەکە ڕۆشن بکاتەوە، لەبەر ئەوە کاتێک بیەوێت باس لە بەشە نەبینراوەکە بکات؛ ئەوا لەبەر ڕۆشنایی ئەو قسانەدا کە لە خاوەنەکەی بیستووە و بەگوێرەی پێوانەکردنی لەسەر ئەو بەشەی کە بینیویەتی؛ باسی لێ دەکات.

بەڵام کەسی دووەمیان توانیویەتی هەندێک لە پەردەکان لا ببات و بەشێکیش لە تاریکییەکە ڕووناک بکاتەوە، بەمەش توانیویەتی هەندێ لە وردەکارییەکان و شێوە و چۆنێتییەکانی ئەو شتانەی پێشتر وەسفەکانیانی بۆ باس کراوە و لە بارەیانەوە چەند زانیارییەکی بیستووە؛ بە چاوی خۆی بیبینێت، بەم پێیەش بینینەکە ڕاستیی بیستنەکەی سەلماند و وەک یەک دەرچوون.

سەرەڕای شاراوەیی ڕاستییەکانی بوونەوەر لە سەردەمی تەفسیرنووسانی پێشیندا، بەڵام تا ڕادەیەکی زۆر سەرکەوتوو بوون لە لێکدانەوەی واتای ئەو ئایەتە قورئانییانەی، کە دەربارەی ئەو ڕاستییانە هاتوون. هەروەها هەر زانایەکی تەفسیر، کە لە سەردەمی ئەودا؛ ڕاستی و چۆنێتییەکانی نیشانەکانی بوونەوەر لە ئاسۆکان و خودی مرۆڤدا نادیار و شاراوە بوون، ئەو لە ڕێی پێوانەکردنیان بە بەشە بینراوەکەی دروستکراوەکان و لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی لە نیگاوە

بیستوویەتی؛ باسی کردوون، بێگومان جیاوازە لەو تەفسیرنووسەی کە نیشانەکانی بوونەوەر لە بەردەمیدا ئاشکرا بوون، بەمەش بیستن و بینینی بەیەکەوە کۆ کردووەتەوە، لە لایەک ئەوەی لە نیگاوە بیستوویەتی و لەولاشەوە ئەوەی لە واقیعدا سەبارەت بە ڕاستی و چۆنێتیی نیشانەکان بینیویەتی.

لە ڕۆژگاری تەفسیرنووسەکانی سەردەمانی ڕابردوودا، لێکدانەوەی بابەتەکانی بواری بوونەوەر بە هەر چەشنێک بووبێت؛ مەترسییەکی نەبووە بۆ مەسەلەی بیروباوەڕ، ئەمەش وای کردووە، کە ئەوان تەنیا لە سنوورەکانی واتای زمانەوانیی دەقەکاندا نەوەستن، بەڵکو هەوڵیان داوە بەپێی ئەو شارەزاییەی خوای گەورە پێی داون لە زانیاری و زانستەکانی سەردەمی خۆیاندا و بەگوێرەی ئەو تێگەیشتنانەی خوا بەهرەمەندی کردوون پێی، دەقەکان ڕاڤە بکەن و شییان بکەنەوە.

تەفسیرنووسەکان بە درێژایی چەندین سەدە، هەوڵ و کۆششی گەورەیان داوە بۆ لێکدانەوەی ئەو دەقانەی نیگا کە پەیوەندییان بەو بابەتانەی بوونەوەرەوە هەیە کە لە سەردەمی ئەواندا نەدۆزراونەتەوە. ئەم هەوڵە مەزنەشیان لەو بوارەدا، دوو شتمان بۆ ڕوون دەکاتەوە: لە لایەکەوە ئاستی زانستیی مرۆڤ لەو سەردەمانەدا، کە لەو بوارانەی بوونەوەردا پێی گەیشتووە، لە لایەکی تریشەوە ڕادەی یارمەتیی خوای گەورە بۆ ئەو تەفسیرنووسانە کە تا ڕادەیەکی زۆر ڕاستییان پێکاوە.

جا کاتێک وادەی ئەوە دێتە پێش، کە "ڕاستی"یەکە لە واقعی بوونەوەردا ببینرێت، ئیتر لەم ساتەدا گونجان و وەک یەکبوونی ئاشکرای نێوان واتاکانی نیگا و ئەو ڕاستییانەی کە بینراون؛ دەردەکەوێت. هەروەها سنوورەکانی زانست و زانیارییەکانی مرۆڤیش دەردەکەون، کە لە لایەکەوە وابەستەن بە پێوەندەکانی هەستێکی سنووردارەوە، لە لایەکی تریشەوە بە چوارچێوەکانی کات و شوێن دیاری کراون. لە هەمان کاتیشدا ئیعجازەکە -بەم بینینە- زیاتر ڕوون و ئاشکرا دەبێت.

خوای گەورە زانایانی سەرکەوتوو کردووە لە شیکردنەوەی ئەو ئایەت و فەرموودانەی کە پەیوەندییان بە نهێنی و لایەنە شاراوەکانی بوونەوەرەوە هەیە، چونکە ئەوان سەرەڕای پشتبەستنیان بە ئاماژە و واتای دەستەواژەکان و مانای ئایەتەکان؛ هاوکات لەبەر ڕۆشنایی و ڕێنمایی دەقەکانی نیگادا ئەو کارەیان کردووە، بێگومان نیگاش لە زاتێکەوە ڕەوانە کراوە کە هەموو نهێنییەکانی زەوی و ئاسمان دەزانێت.

## خۆشحاڵیی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر)
## بە هۆی دەرکەوتنی (چوونیەکی) لەنێوان نیگا و واقیعدا

ئیمامی (مسلم) لە سەحیحەکەیدا[1] لە فاتیمەی کچی قەیسەوە گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: ((... فلما قضى رسول الله ﷺ صلاته جلس على المنبر وهو يضحك، فقال: ليلزم كل إنسان مصلاه. ثم قال: أتدرون لم جمعتكم؟! قالوا: ألله ورسوله أعلم. قال: إني والله ما جمعتكم لرغبة ولا لرهبة، ولكن جمعتكم لأن تميما الداري، كان رجلا نصرانيا، فجاء فبايع وأسلم، وحدثني حديثا وافق الذي كنت أحدثكم عن مسيح الدجال)). واتە: "دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر) لە نوێژەکەی بووەوە، بەپێکەنینەوە لەسەر مینبەرەکە دانیشت و فەرمووی: با هەر کەس لە جێ نوێژەکەی خۆی بمێنێتەوە، پاشان فەرمووی: ئایا دەزانن لەبەر چی کۆم کردوونەتەوە؟ لە وەڵامدا وتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن. فەرمووی: سوێند بە خوا نە بۆ هیچ داخوازییەک و نە لەبەر هیچ ترسێک ئێوەم کۆ نەکردووەتەوە، بەڵکو تەنیا بۆ ئەوە کۆم کردوونەتەوە پێتان ڕابگەیەنم: کە (تەمیمی داری) پیاوێکی گاور بوو، هات و پەیمانی دا و مسوڵمان بوو، پاشان باسێکی بۆ گێڕامەوە، کتومت وەکو ئەو باسە وابوو، کە من دەربارەی مەسیحی دەجال بۆ ئێوەم باس کردبوو."

پاشان باسی بەسەرهاتی تەمیمی داری و گەشتەکەی بۆ کردن، کە زیاتر لە مانگێک لە دەریادا بووە و هەموو قسەکانی چوونیەک بوون لەگەڵ فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا (دورودی خوای لەسەر)، کە پێشتر بۆی باس کردوون.

**نموونەیەکی تر:**

[1] صحيح مسلم (كتاب الفتن و أشراط الساعة)، باب قصة الجساسة، حديث رقم ١١٩، ٢٩٤٢.

خەڵکی بەگومان بوون لە نەژادی (ئوسامەی کوڕی زەید)، خاتوو (عائیشە - ڕەزای خوای لێ بێت) لەم بارەیەوە وتوویەتی: ((ان رسول الله ﷺ دخل علي مسرورا، تبرق أسارير وجهه فقال: ألم تر أن مجززا[1] نظر آنفا إلى زيد بن حارثة وأسامة بن زيد (وفي رواية وعليهما قطيفة قد غطيا رؤوسهما وبدت أقدامهما) [2]، فقال: إن هذه الأقدام بعضها من بعض))، واتە: "ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر) هات بۆ لام و دیاربوو، کە خۆشحاڵە و ڕووی پیرۆزی لە خۆشحاڵیدا دەگەشایەوە و فەرمووی: نەتزانیوە کە موجەزیز کەمێ لەمەوبەر تەماشای زەیدی کوڕی حاریسە و ئوسامەی کوڕی زەیدی کردووە و [لە ڕیوایەتێکی تردا: پارچە قەیفەیەکیان داوە بە خۆیاندا، بە جۆرێک سەریان داپۆشیوە و تەنیا قاچیان بە دەرەوە بووە] ئیتر وتوویەتی: ئەم قاچانە هیی دوو کەسە لە یەک ڕەچەڵەکن و کەسی یەکترن."

بەم جۆرە کاتێک بەڵگە لە واقیعی بەرچاو و بینراوەوە دەرکەوتووە و ناکۆکییەکەی یەکلا کردووەتەوە و گومانەکەی ڕەواندووەتەوە، ئیتر ئەمە بووە بە مایەی خۆشحاڵیی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر) ڕووی پیرۆزی لە خۆشیدا گەشاوەتەوە. بە هەمان شێوەش لەم سەردەمەی خۆماندا دەبێ باوەڕدار چەندە خۆشحاڵ بێت، کاتێک بە چاوی خۆی ئەوە دەبینێت، کە ڕاستییەکانی واقیع و بەڵگە بینراوە زۆرەکان تەواو چوونیەکن لەگەڵ ئەو باسانەدا، کە لەپێش هەزار و چوار سەد ساڵ لە نیگادا باسکراون.

---

[1] مجزز: كان قائفا والقائف هو الذي يعرف الشبه ويميز الأثر: موجەزیز ناوی کەسێکی ڕەچەڵەکناس و شوێنپێهەڵگر بووە، ڕەچەڵەکناسیش کەسێکە بە لێکچوونی ڕووخسار و شێوەدا؛ ڕەچەڵەکی کەسێک دیاری دەکات و هەروەها شوێنەواریش لەیەک جیا دەکاتەوە و شوێنپێیەکان دەناسێتەوە.

[2] بڕوانە: فتح الباري، ج١٢، ل٥٦.

# گرنگیی توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستی و بەرهەمەکانی

**١. نوێکردنەوەی بەڵگەی سەلماندنی پەیامی ئیسلام لە سەردەمی دۆزینەوە زانستییەکاندا:**

ئەگەر خەڵکانی سەردەمی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر) زۆرێک لە موعجیزەکانیان بە چاوی خۆیان بینیبێت، ئەوا خوای گەورە خەڵکی ئەم سەردەمەشی بێبەش نەکردووە و موعجیزەیەکی تری پێغەمبەرەکەی (درووودی خوای لەسەر) پیشان داون، کە لەگەڵ ئەم سەردەمەدا گونجاوە، تاوەکو بە هۆی ئەم موعجیزەیەوە بۆیان ڕوون بێتەوە، کە قورئان ڕاست و ڕەوایە.

ئەم بەڵگە و موعجیزەیەش بریتییە لە: بەڵگەی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا. لە ڕاستییشدا خەڵکی ئەم سەردەمە -سەرەڕای جیاوازیی ڕەگەز و نیشتمان و ئایینیان- هێندەی لەبەردەم زانست و بەڵگە و نیشانە زانستییەکاندا ملکەچی دەنوێنن؛ هەرگیز بەو چەشنە گەردنگیری هیچ شتێکی تر نابن. جا هەر کەسێک لە سەرتاپای ڕەگەزەکان، ئەگەر هەقویست و ڕاستیخواز بێت، ئەوا بە یارمەتیی خوای گەورە توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستی ئەوە دەستەبەر دەکەن کە ڕوونترین بەڵگە و بەهێزترین نیشانەی پێشکەش بکەن، کە هۆکارن بۆ بەهێزبوونی دڵنیایی و زیادبوونی باوەڕی باوەڕداران. وەکو خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ (الأنفال: ٢)، واتە: "کاتێک ئایەتەکانی خوای گەورەیان بەسەردا بخوێنرێتەوە، باوەڕیان زیاد دەکات."

ئاشکرابوونی ئەم بەڵگە زانستییانەش، سەرلەنوێ و بۆ جارێکی دی متمانە دەبەخشێتەوە بە دڵ و دەروونی ئەو مسوڵمانانەی، کە بێباوەڕان توانیویانە -بە ناوی ئەو زانستەی پێشکەوتن و شارستانی لەسەر بنیات نراوە، لەخشتەیان بەرن و لە ئایینەکەیان وەریانچەرخێنن.

### ٢. ڕاستکردنەوەی ڕێڕەوی زانستی ئەزموونی لە جیهاندا:

خوای گەورە بنەمای (تێڕوانین بۆ دروستکراوەکان)ی کردووە بە ڕێگایەک لە ڕێگاکانی باوەڕهێنان بە خۆی و بە پێغەمبەرەکەی (دروودی خوای لەسەر). زانستە ئەزموونییەکانیش لەسەر هەمان بنەما دامەزراون، لەم ڕووەشەوە باوەڕ و زانست دەستلەملانی یەکترن.

بەڵام شوێنکەوتووانی ئایینە شێوێنراو و دەستکاریکراوەکان؛ ڕاستییە زانستییەکانیان بەدرۆ خستووەتەوە و بە بێبایەخ تەماشای ڕێبازە زانستییەکانیان کردووە، بانگخوازانی بوارە زانستییەکانیشیان دەچەوساندەوە، ئەمەش وای لە هەڵگرانی زانستە ئەزموونییەکان کرد بە ڕوویاندا بوەستنەوە و جەنگ لە دژی ئایینەکانیان ڕابگەیەنن و بیروباوەڕە پڕوپووچەکانی نێو ئەم ئایینانە ئاشکرا بکەن و پەردە لەسەر ناڕاستییەکانیان هەڵماڵن، -لە میانەی ئەم بارودۆخە ناهەموارەدا- سەرەنجام مرۆڤایەتی چەواشە بووە و کەوتووەتە ناو گێژاوی سەرلێشێوانەوە و بەردەوامیش بەدوای ئەو ئایینە ڕاستەقینەیەدا دەگەڕێت، کە لەگەڵ زانستدا کۆکە و بانگەوازی بۆ دەکات و هاوکات زانستیش بانگەواز بۆ لای ئەو بکات.

لەبەر ئەوە -لە بارودۆخێکی وەهادا- دەکرێت مسوڵمانان دەستپێشخەری بکەن بۆ ڕاستکردنەوەی ڕێڕەوی زانست لە جیهاندا و هەوڵ بدەن لە جێگەی ڕاست و شیاوی خۆیدا دایبنێنەوە، بە جۆرێک ببێتەوە بە ڕێگەیەک بۆ باوەڕهێنان بە خوای گەورە و بە پێغەمبەرەکەی (دروودی خوای لەسەر)، هەروەها ببێت بە سەلمێنەری ڕاستییەکانی نێو قورئان و بە بەڵگەیەک لەسەر ڕاستیی ئیسلام، شایەتیش بێت لەسەر شێواندن و دەستکاریکردنی ئایینەکانی تر. مرۆڤایەتی پێویستی بە ئایینێکی ڕاستەقینەیە، کە بەفریایەوە بێت و لەو بارە ناهەموارەی بەسەری هاتووە؛ ڕزگاری بکات و بۆشایی لایەنی ڕۆحیی بۆ پڕ بکاتەوە، هەستوسۆزیشی لە وێڵبوون و دڵ و دەروونی لە بەدبەختی دەرباز بکات.

ئایینێکی وەها، کە زانست و ئایینی بەیەکەوە بۆ گرێ بدات و ماددە و ڕۆحیش بەیەکەوە ببەستێت و ڕژێم و ڕەوشتی بۆ دابین بکات و بەختیاریی دنیا

و پاداشتی باشی دوارۆژیشی بۆ فەراهەم بێنێت. بەڵام بۆ گەیشتنی بەم مەبەستە -پێش هەموو شتێک- پێویستی بە بەڵگەیەکی زانستییە، کە ڕاستی و دروستیی ئایینەکەی بۆ بسەلمێنێت. توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستییش وەڵامن بۆ ئەم پرسە. یەکێک لەو خاڵانەش، کە مژدەبەخشن بە شیاوی بەدیهێنانی ئەم ئامانجە، بریتییە لە: بوونی بنکەیەکی گەورە لە زانایانی خاوەن ویژدان (منصف) لە ڕیزی زانایانی بوونەوەردا، کە هەرگیز دوودڵی نانوێنن لە ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییانەدا کە قەناعەتی پێدەکەن، ئەمە سەرەڕای ئەوەی، کە ئەوان خەڵکانێکی قسەڕۆیشتوون لەنێو گەلانی خۆیاندا و ڕێز لە قسەکانیان دەگیرێت و لە زۆربەی وڵاتانی جیهانیشدا؛ کەسانی ملهوڕ و نکوڵیکەر دەسەڵاتیان نییە بەسەریاندا و ناتوانن ڕێیان لێ بگرن یان دەست بێننە ڕێیان، تەنیا لەو وڵاتە شیوعییانەدا نەبێت کە بێباوەڕییان کردووە بە بەرنامە بۆ ژیان. بەڵام پێدەچێت ئامرازە هاوچەرخەکانی ڕاگەیاندن؛ هۆکارێکی گونجاو بن بۆ گەیاندنی ڕاستییەکانی زانست و باوەڕ تەنانەت بە خەڵکی ئەم وڵاتانەش، لەوانەشە خوای گەورە دەروازەی خێریان بە جۆرێک تیا واڵا بکات، کە لە جێگەکانی تر بەو چەشنە نەرەخسێت.

### ٣. کاراکردنی مسوڵمانان لە بواری دۆزینەوەکانی بوونەوەردا بە هۆی هاندەرە ئیمانییەکانەوە:

لە ڕاستیدا بیرکردنەوە لە دروستکراوەکانی خوای گەورە، بەشێکە لە خواپەرستی، بە هەمان شێوە بیرکردنەوەش لە واتای ئایەتەکان و فەرموودەکان وێنەیەکی تری خواپەرستییە، هەروەها خستنەڕووشیان بۆ خەڵکی بریتییە لە بانگەواز بۆ لای خوای گەورە، هەموو ئەم واتایانەش لە توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستە بوون و بەدی هاتوون.

ئەمەش خۆی بۆ خۆی هۆکارێکە بۆ هاندان و هەڵنانی مسوڵمانان کە لە میانەی چەندین پاڵنەر و هاندەری ئیمانییەوە؛ کار بۆ دۆزینەوەی نهێنییەکانی بوونەوەر بکەن، بەئومێدی ئەوەی ئەم کارەیان ببێتە مایەی تێپەڕاندنی قۆناغی دواکەوتنیان لەم بوارانەدا کە ڕۆژگارێک تیا ژیاون. کاتێکیش توێژەرانی مسوڵمان

دێنە گۆڕەپانی توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستییەوە، ئەوە بەدی دەکەن کە فەرموودەکانی خوای بەدیهێنەر دەربارەی نهێنیی دروستکراوەکانی خۆی؛ چەندین نیشانە و بەڵگەیان لەخۆ گرتووە کە لە کاتی لێکۆڵینەوەکانیاندا ڕێنماییان دەکەن و دەبن بە ڕێنیشاندەریان و ئەنجامەکانیان بۆ نزیک دەکەنەوە، هەروەها بەشێک لە ڕەنج و ماندووبوون و هەوڵ و تەقەلای زیادەیان لەسەر لا دەبەن.

## ئەرکی مسوڵمانان

ئەگەر بزانین، بایەخ و گرنگیی توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستی لە هەر یەکێک لەم بوارانەی خوارەوەدا چەندە، ئەوکات بۆمان دەردەکەوێت کە ئەرکی ئەنجامدانی ئەم توێژینەوانە یەکێکە لە گرنگترین فەرزەکانی کیفایەت. بوارەکانیش ئەمانەن:

- بەهێزکردنی باوەڕی باوەڕداران.
- بەرپەرچدانەوەی ئەو هەوڵانەی، کە بێباوەڕان بەرگی زانستیان بە بەردا کردووە و دەیانەوێت خەڵکانێکی مسوڵمان بە ناوی زانستەوە لەخشتە بەرن.
- بانگکردنی خەڵکانێکی نامسوڵمان بەرەو ئیسلام.
- تێگەیشتنمان لەو فەرمایشتانەی، کە لە قورئان و سوننەتدا ئاڕاستەمان کراون.
- هاندانی مسوڵمانان بۆ بەدەستهێنانی هۆکارەکانی بووژانەوەی زانستی.

وەکو خوای گەورە -لە بارەی گرنگیی بەڵگەوە- دەفەرمووێت: ﴿لَمْ يَكُنْ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّى تَأْتِيَهُمْ الْبَيِّنَةُ﴾ (البينة: ١).

واتە: "ئەوانەی، کە بێباوەڕ بوون لە خاوەن کتێبەکانی ڕابردوو و موشریکەکان؛ واز لە بیروباوەڕی خۆیان ناهێنن و دەستی لێ هەڵناگرن، تا بەڵگە و نیشانەی ڕوون و ئاشکرایان بۆ نەیەت."

## بوارەکانی توێژینەوەی ئیعجازی زانستی

هەر بابەتێک لە هەر بوارێکی زانستدا کە قورئان یان سوننەت باسیان کردبێت و ڕاستییەکەی ئاشکرا بووبێت، بە چەشنێک ئەوە دووپات بکاتەوە کە هەواڵی نیگا سەبارەت بەو ڕاستییە تەنیا لەلایەن خواوەیە؛ ئەوا ئەو بابەتە بوارێکە لە بوارەکانی توێژینەوەی "ئیعجازی زانستی".

بەڵام لێرەدا مەبەست لەم زاراوەیە، ئەو ئیعجازە زانستییەیە کە زانستە نوێیەکان دەریانخستووە.

کەوابوو –بەپێی ئەم چەمکە– مەیدانەکان، یان بوارەکانی توێژینەوەی ئیعجازی زانستی بریتین لە:

١. ئەو مەیدان و بوارانەی بوونەوەر، کە لە قورئان و سوننەتدا باس کراون یان ئاماژەیان بۆ کراوە و زانستی مرۆڤیش توانیویەتی نهێنییەکانیان بزانێت.

٢. ئەو بوارانەی توێژەر پێویستی پێیان دەبێت بۆ لێکدانەوە و تەفسیری دەقە شەرعییەکان بە شێوەیەکی ڕاست و دروست و ڕەوان و دوور لە لادان.

٣. بواری زانینی مێژووی زانستەکان و ڕەوتی پێشکەوتنیان، کە یارمەتیی توێژەر دەدات لە ڕۆشنکردنەوەی چەندین لایەنی ئیعجازەکەدا.

***** *****

# بابەتی دووەم

# بەڵگەکانی گونجاندن لەنێوان

# دەقە قورئانییەکان و ئەنجامە زانستییە ڕاستەکاندا

پ. د. سوعاد یەلدرم

سەرۆکی بەشی تەفسیر زانکۆی ئەتاتورک تورکیا

سوپاس و ستایش بۆ خوای تاک و تەنیا، درووود و سڵاویش لەسەر بەندە هەڵبژێردراوەکانی بێت.

لە ڕاستیدا زاراوەکانی "ئیعجازی زانستی" و "تەفسیری زانستی" و "موعجیزەی زانستی"، لەو دەستەواژانەن، کە تازە داهێنراون و لە سەردەمی نوێدا بڵاو بوونەتەوە. وەکو زانراویشە مەبەست لەم دەستەواژانە بریتییە لە: لێکدانەوەی هەندێک لە ئایەتەکانی قورئان، بە جۆرێک، کە لەگەڵ هەندێ لە تیۆرەکان یان دۆزینەوە نوێیەکانی بواری زانستە سروشتییەکاندا بگونجێن.

ژمارەی ئەو نووسەر و دانەرە هاوچەرخانەش کەم نین، کە هەوڵیان داوە گونجانی نێوان واتا قورئانییەکان و مەسەلە زانستییەکان بخەنە ڕوو.

بەڵام لەبەر ئەوەی بەشێکیان زیادەڕۆییان کردووە لەم بوارەدا، زۆر جاریش زۆرلەخۆکردن یان بەزۆرسەپاندن لە کارەکانیاندا ڕەنگی داوەتەوە، ئەمە بووەتە مایەی دەرکەوتنی کەسانێک، کە ئەم بابەتە فەرامۆش بکەن و ڕاستەوخۆ نکوڵی لەم گونجاندنە بکەن.

هەر چەندە زۆربەی ئەو تەفسیرنووسانەی لەم سەدەیەی دواییدا ژیاون، بە شێوەیەکی مامناوەند لەم باسە دواون و لە ڕاستەڕێ لایان نەداوە.

ئێمەش لەم لێکۆڵینەوەیەماندا دەمانەوێت بناغەڕێژی بۆ ئەم هەڵوێستە میانڕەو و مامناوەندە بکەین و هەندێ لە بەڵگە و پاڵپشتەکانی ئاشکرا بکەین، ئەمەش تەنیا بە پشتیوانیی پەروەردگار.

## ڕا و بۆچوونی ڕەخنەگران لە تەفسیری زانستی:

پێش ئەوەی بچینە ناو بابەتەکەوە؛ باش وایە هەندێ لە ڕا و بۆچوونی ڕەخنەگران و بەرهەڵستکارانی تەفسیری زانستی بخەینە ڕوو و لێیان بدوێین، لە پێشەنگی هەمووشیاندا:

**یەکەم: ڕا و بۆچوونی ئەبو ئیسحاقی شاتیبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کە لە ساڵی (٧٩٠ک) وەفاتی کردووە، لە پەرتووکی (الموافقات)دا، بەرگی (٢)، لاپەڕە ٥٥ تا ٥٦، وتوویەتی:**

خەڵکێکی زۆر لە بانگەشەکردنیاندا بۆ قورئان و بە ناوی قورئانەوە سنووریان تێپەڕاندووە، بە جۆرێک، کە هەموو ئەو زانستانەیان خستووەتە پاڵ کە خەڵکانی پێشین یان پاشین لێی دواون. هەر لە بواری زانستە سروشتییەکان و فێرکارییەکان و ژیربێژی و زانستی پیتەکان و هەموو ئەو بابەتانەش کە تایبەتمەندانی بوارە زانستییە جۆراوجۆرەکان تێیان ڕوانیوە و هەر بوارێکی تری هاوشێوەش، لە ڕاستیدا ئەگەر ئەم بانگەشانەی ئەوان بەراورد بکەین لەگەڵ ئەوەی لە پێشدا باسمان کرد[1]؛ ئەوا هیچیان ڕاست دەرناچن.

لەگەڵ ئەمەشدا ئاشکرایە، کە پێشینانی چاکەکار (السلف الصالح) لە هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان و ئەوانەش دوای ئەوان هاتوون؛ لە هەموو کەس زاناتر بوون بە قورئان و زانستەکانی و ئەو نهێنییانەش لە قورئاندا هەیە، بەڵام سەرەڕای ئەمەش نەمانبیستووە هیچ یەکێک لەوان دەربارەی ئەم بانگەشە و باسانە دوابێت، تەنیا قسەیان لەسەر ئەو شتانە کردووە کە پێشتر باسمان کرد، هەروەها باسیان لە فەرمانی ئەرکەکان و حوکمەکانی ڕۆژی دوایی و بابەتە هاوشێوەکانیان کردووە. خۆ ئەگەر ئەوان خۆیان لەو باسانە بدایە و تێڕوانینیان لە بارەوە هەبووایە، ئەوا بێگومان هەر شتێکمان لە قسە و باسەکانیان پێدەگەیشت کە بنەڕەتی ئەم مەسەلەیەی بۆ دەرخستینایە. بەڵام شتێکی لەم جۆرە نەبووە و هیچمان پێ نەگەیشتووە، کە ئەوە دەسەلمێنێت ئەم بابەتە لای ئەوان لەئارادا

[1] مەبەست لەو باسانەیە، کە لە کتێبەکەیدا (الموافقات)، لەپێش ئەم برگەیەوە باسی کردووە.

نەبووە و ئەمەش بۆخۆی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە قورئان هیچ بەڵگە و سەلماندنێکی تیا نییە بۆ ئەو جۆرە بانگەشەیەی ئەوان."

پاشان (شاتیبی) وای داناوە کە ئەو واتایانەی عەرەب لە زمانی خۆیدا بەکاری نەهێناون و نەیناسیون؛ واتاگەلێکن پشتیان پێ نابەسترێت و بەهەند وەرناگیرێن، لەم بارەیەوە دەڵێت: "ڕەنگە ئەو جۆرە کەسانە ئەوەیان کردبێت بە بەڵگە بۆ بانگەشەکەیان کە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ﴾ (النحل: ٨٩)، واتە: "ئەی (محەمەد - دروودی خوای لەسەر) ئێمە قورئانمان ناردووەتە خوارەوە بۆ تۆ کە ڕوونکەرەوەی هەموو شتێکە." یان ئایەتی: ﴿ مَا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِنْ شَيْءٍ﴾ (الأنعام: ٣٨) واتە: "هیچ شتێکمان لە کتێبەکەدا فەرامۆش نەکردووە."

هەروەها هاوشێوەی ئەم ئایەتانە...

بەڵام واتای ئەم ئایەتانە لای زانایانی تەفسیر بە جۆرێکی ترە و مەبەست لە (هەموو شتێک)، ئەو شتانەیە کە پەیوەندییان بە باری ئەرک و پەرستنەوە هەیە، مەبەستیش لە (کتاب) لە ئایەتی دووەمدا: ﴿مَا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِنْ شَيْءٍ﴾ بریتییە لە "اللوح المحفوظ".

ئەوان لە تەفسیری ئەم ئایەتانەدا، شتێکی وایان باس نەکردووە ئەوە بگەیەنێت، کە قورئان هەموو ئەو زانستە نەقڵی و ئەقڵییانەی لەخۆ گرتبێت، لەبەر ئەوە دروست نییە شتێک بدرێتە پاڵ قورئان، کە قورئان نەیخوازێت و لەخۆی نەگرتبێت، هەروەک ناگونجێت نکوڵی لە شتێک بکرێت، کە بیخوازێت.

بۆ هەوڵی تێگەیشتنیش لە قورئان؛ پێویستە تەنیا پشت بەو زانیارییانە ببەسترێت کە لە زمانی عەرەبییەوە سەرچاوەیان گرتووە و بەتایبەتی عەرەب لە زمانی خۆیاندا پێی ئاشنا بوون، چونکە تەنیا لەم ڕێگەیەوە دەگەینە زانین و شارەزابوون لەو حوکمە شەرعییانەی کە لە قورئاندان. جا هەر کەسێک ویستبێتی بە کەرەستەیەکی تر، یان لە ڕێی ئامرازێکی ترەوە لە غەیری

ئامرازەکانی خۆی لە قورئان تێبگات، ئەوا گومڕا بووە و وەک خۆی لێی تێنەگەیشتووە و قسەی بەدەم خوا و پێغەمبەرەوە (درووودی خوای لەسەر) هەڵبەستووە، خوای گەورەش زاناترە و هەر ئەویش پشتیوانە[1].

**دووەم: ڕا و بۆچوونی (د. محمد حسين الذهبي):**

دەکرێت (د. محمد حسين الذهبي) بە نوێنەری نکۆڵیکەرانی تەفسیری زانستی دابنێین. ئەو بەم جۆرە پێناسەی تەفسیری زانستی دەکات: تەفسیری زانستی بریتییە لەو تەفسیرەی، کە زاراوە زانستییەکان دەکات بە سەنگی مەحەکی لێکدانەوەی دەستەواژە قورئانییەکان و هەوڵی ئەوە دەدات، هەر چی زانستە هەمەجۆر و ڕا و بۆچوونە فەلسەفییەکانە، لێوەی دەربهێنێت. دکتۆری ناوبراو لە چەند ڕوویەکەوە بەرهەڵستی تەفسیری زانستی دەکات و ڕەخنەی لێ دەگرێت، کە بریتییە لەم لایەنانەی لای خوارەوە:

**١. لایەنی زمانەوانی**

لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا؛ زۆرێک لە وشە و دەربڕینە قورئانییەکان، گۆڕاون و مەبەست و واتاکانیان فراوان بووە، هەموو واتاکانیش لە یەک دەربڕیندا کۆ دەبنەوە و چەندین واتای جۆراوجۆر لە یەک وشەدا بەدی دێت، هەندێک لەم واتایانە هەر لە کاتی هاتنەخوارەوەی قورئاندا؛ عەرەبەکان زانیویانە و پێی ئاشنا بوون، هەندێ واتاش ئەوان لەو سەردەمەدا هیچیان لە بارەوە نەزانیوە، چونکە شتێکی نوێیە و تازە هاتووەتە سەر واتای وشەکە، جا ئایا تا چەند پەسەندە ئێمە بەم شێوە بەرفراوان و سەیرە لەگەڵ تێگەیشتنی دەربڕینە قورئانییەکاندا ڕەفتار بکەین و بە جۆرێک لێکیان بدەینەوە مانای ئەو زاراوانە بگەیەنن کە تازە پەیدا بوون و هاتوونەتە ئاراوە!

---

[1] الموافقات، بەرگی ٢، لاپەڕە ٥٥-٥٦، لە مەسەلەی چوارەمدا، جۆری دووەم، بابەتی (في بيان قصد الشارع في وضع الشريعة للافهام).

### ٢. لایەنی ڕەوانبێژی

ڕەوانبێژی بریتییە لە گونجانی قسە لەگەڵ خواست و پێویستیی بارێکی دیاریکراودا. بەگوێرەی ئەمە؛ تەفسیری زانستی قورئان، زیان بە لایەنی ڕەوانبێژی قورئان دەگەیەنێت، چونکە ئەو کەسانەی بە قورئان دوێنراون -لە ساتی هاتنەخوارەوەیدا-؛ ئەگەر ئەم واتایانەیان نەزانیبێت و پەروەردگاریش لە دواندنیاندا مەبەستی ئەم واتایانە بووبێت؛ ئەمە ئەوە دەگەیەنێت، کە قورئان کاریگەر نەبووە و ڕەوانبێژیی تیا نییە، چونکە حاڵەتی کەسی بانگکراوی ڕەچاو نەکردووە، ئەگەر واتاکانیشیان زانیوە؛ ئەی بۆچی بووژانەوەی زانستی لە ناو عەرەبدا هەر لە سەردەمی هاتنەخوارەوەی قورئانەوە دەرنەکەوتووە و سەری هەڵنەداوە، لە کاتێکدا کە قورئان زانستەکانی خەڵکانی پێشین و پاشینیشی لەخۆ گرتووە!

### ٣. لایەنی بیروباوەڕ

خوای گەورە قورئانی بۆ هەموو خەڵکی ناردووە تا ڕۆژی دوایی، جا ئەگەر ئێمە ڕێبازی ئەوانە بگرینە بەر، کە هەموو شتێک دەخەنەوە سەر قورئان و قورئانمان کرد بە سەرچاوەی زانستەکان؛ ئەوا گومان و دوودڵی دەخەینە بیروباوەڕی مسوڵمانانەوە بەرامبەر بە قورئانی پیرۆز، ئەمەش لەبەر ئەوەی، کە ڕێسا زانستییەکان و ئەو بیردۆزانەش کە لەسەریان دامەزراون؛ نە جێگیرن و نە بەردەوامیشن.

ئەگەر ئێمە واتاکانی قورئان بەگوێرەی ئەو بیردۆزە گۆڕاوانە ئاڕاستە بکەین کە قورئان نایخوازێت، پاشان نادروستی و پووچیی ئەو بیردۆزانە دەربکەوێت؛ ئەوا ئەمە دەبێتە مایەی لەقکردنی بیروباوەڕی مسوڵمانان بەرامبەر بە قورئانی پیرۆز، چونکە ناکرێت و ناگونجێت قورئان ئەمڕۆ شتێک بەدرۆ بخاتەوە کە دوێنێ بە ڕاستی زانیوە[١].

---

[١] تەماشای (التفسیر والمفسرون)ی (د. الذهبي) بکە.

ئەمە پوختەی قسەکانی (د. الذهبي) بوو، بەڵام ئێمە پێمانوایە، کە (د. الذهبي) لەم خوێندنەوانەیدا وەڵامی ئەو کەسانە دەداتەوە، کە زیادەڕەو بوون و لەڕادەبەدەر ڕۆچوون لە بواری گونجاندن و یەکخستنی دەقە قورئانییەکان و مەسەلە زانستییەکاندا، چونکە وەک دەردەکەوێت و-لە دوا نووسینیدا لەم بارەیەوە دیارە- ئەو یەکسەری بەرهەڵستی ئەوە ناکات، کە قورئان ئاماژە بە هەندێک لە ڕاستییە زانستییەکان بکات و لەم بارەیەوە وتوویەتی: "ئەوەندەیان بەسە، کە قورئان هیچ دەقێکی ئاشکرای تیا نییە پێچەوانەی ڕاستییەکی زانستیی چەسپاو بێت، ئەوەندەش بەسە بۆ قورئان، کە دەکرێت گونجان بەدی بێت لەنێوان ئەم و هەموو ئەو بیردۆز و یاسا زانستییانەدا کە لە ڕابردوو و ئێستا و داهاتووشدا هاتوون و دێنە کایەوە و لەسەر بنچینەیەکی ڕەوا و بنەڕەتێکی ڕاست و دروست دامەزراون."

جا ئایا ئەمە خۆی موعجیزەیەکی زانستی نییە، کە قورئان لەگەڵ ڕاستییە زانستییە چەسپاوەکاندا دژیەک نییە[1].

**سێیەم: ئیعجازی زانستیی قورئان و ڕا و بۆچوونی هەریەک لە (ئیبن عاشور و سەعیدی نوورسی):**

لە لاپەڕەکانی داهاتوودا؛ ڕا و بۆچوونەکانی پێشەوە دەخەینە ژێر باس و ڕەخنەوە و لەم بوارەدا سوود لە ڕوانگەی تەفسیرنووسە هاوچەرخەکان وەردەگرین، بەتایبەتی مامۆستا (محمد الطاهر بن عاشور) لە تونس و پێشەوا (سەعیدی نوورسی) لە تورکیا.

چونکە هەردووکیان خاوەنی فەزڵێکی گەورەن لەم بوارەدا و توانیویانە زۆر سەرکەوتووانە کاری بنەڕەتدۆزی (بنچینەڕێژی) بۆ ئەم ڕێبازە ڕاست و دروستە لە تەفسیری قورئانی پیرۆزدا، بەئەنجام بگەیەنن.

---

[1] بەڵێ ئەمە وایە، بەڵام ئەمە شتێکە و ئەوەش کە قورئانی پیرۆز سەرچاوەیەکی ڕاستەوخۆی وردەکاریی ڕاستییە زانستییەکان بێت؛ شتێکی ترە!

هەروەها لەبەر ئەوەش، کە لەناو تەفسیرنووسەکاندا هێندە ناوبانگیان دەرنەکردووە، هێندەی خۆیان شایستەین.

(ئیبن عاشور - ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە تەفسیرەکەیدا، لە پێشەکیی ژمارە ۱۰، بەرگی ۱، لاپەڕە ۱۲۷-۱۲۹، لە باسی ئیعجازی قورئاندا دەڵێت: "جۆری دووەم لە ئیعجازی زانستیی قورئان، دەبێت بە دوو بەشەوە: **بەشێکیان** تەنیا بە بیستن و تێگەیشتنی، پەی پێ دەبرێت و دەزانرێت. **بەشەکەی** تریان بۆ زانینی ڕووی ئیعجازەکەی، پێویست بە شارەزابوون و زانینی ڕێسا زانستییەکان دەکات. ئیتر بەگوێرەی ئاستەکانی تێگەیشتن و پەرەسەندنی زانستەکان، بەرە بەرە ڕووی ئیعجازەکەی وەکو ڕۆشنایی و سپێدەی بەرەبەیان دەردەکەوێت و ئاشکرا دەبێت."

هەردوو بەشەکەش بەڵگەن لەسەر ئەوەی، کە قورئان لەلایەن خواوە ڕەوانە کراوە، چونکە "نەخوێندەوارێک" هێناویەتی و لە جێگەیەکیشدا کە خەڵکەکەی لە وردەکارییەکانی زانستیان نەکۆڵیوەتەوە و هەر لەناو ئەوانیشدا نیشتەجێ بووە و لێیان جیا نەبووەتەوە و دانەبڕاوە[1].

قورئانی پیرۆزیش هێما بۆ ئەم لایەنەی ئیعجاز دەکات، وەکو لە سوورەتی (القصص)دا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ فَأْتُوا بِكِتَابٍ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ هُوَ أَهْدَى مِنْهُمَا أَتَّبِعْهُ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ(٤٩)فَإِنْ لَمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِنْ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ(٥٠)﴾ (القصص: ٤٩-٥٠)، واتە: "ئەی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر) پێیان بڵێ: دەسا ئێوە کتێبێکی تر بهێنن لەلایەن خواوە، کە باشتر و چاکتر بێت لەو دووانە (قورئان و تەورات)؛ ئەوە منیش شوێنی دەکەوم، ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن، خۆ ئەگەر بەدەم بانگەوازەکەی تۆوە نەهاتن و وەڵامیان نەدایەوە

---

[1] مەبەست ئەوەیە کە نەچووەتە ناو خەڵکانێکەوە خاوەنی زانست بن، یان نەچووە بۆ شوێنێک کە مەڵبەندی ئەو زانستانە بێت، تاوەکو لەوانەوە فێر بووبێت. (وەرگێر)

(واته نەیانتوانی کتێبێکی تر بهێنن)؛ ئەوە چاک بزانە، کە ئەوانە هەر شوێنی ئارەزووی خۆیان دەکەون.ˮ

پاشان ئەم لایەنەی ئیعجازی قورئان بەوە کۆتایی نەهاتووە کە قورئان بەشداریی زانایانی کردبێت لە باسی ئەو زانستانەدا کە ئەو کاتە بوویانە، بەڵکو سەر کەوتووە بۆ ئاستێکی باڵاتر لەوان و باسی ئەو شتانەی کردووە کە ئەوان پێی ئاشنا نەبوون و ئەوانەشی تێپەڕاندووە کە ئەوان خوێندوویانە و پێی ئاشنا بوون.

(ابن عرفة) لە باسی ئایەتی (٢٧)ی سوورەتی (آل عمران)دا: ﴿**تُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَتُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَتُخْرِجُ الْحَيَّ مِنْ الْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنْ الْحَيِّ وَتَرْزُقُ مَنْ تَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ**﴾ دەڵێت: ˮهەندێکیان وتوویانە: قورئان وشە و زاراوەی وای لەخۆ گرتووە کەسانی ئاسایی لێی تێدەگەن، هەندێکی تریشی کەسانی تایبەت لێی تێدەگەن، هەندێ وشە و زاراوەشی تیایە، کە هەردوولا لێی تێدەگەن، ئەم ئایەتەش لەم جۆرەیانە، چونکە ˮالایلاجˮ (خستنەناو) ئەو ڕۆژانە دەگرێتەوە، کە تەنیا کەسانی تایبەتمەند درکی پێ دەکەن، هەروەها واتای ئەو وەرزانەش دەگەیەنێت، کە سەرجەم خەڵکی ئاسایی دەیزانن.ˮ

منیش دەڵێم[١]: هەروەها ئەم ئایەتەش لە هەمان جۆرە، کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**أَوَلَمْ يَرَى الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنْ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلاَ يُؤْمِنُونَ**﴾ (الأنبياء: ٣٠)، واتە: ˮئاسمانەکان و زەوی؛ هەردووکیان پێکەوە لکابوون (یەک پارچە بوون)، ئینجا لە یەکترمان جیا کردنەوە.ˮ

---

[١] واتە (إبن عاشور)

یەکێکی تر، لە شێوازەکانی ئیعجازی زانستیی قورئان ئەوەیە: بانگەشەی کردووە بۆ تێڕوانین و گەڕان بەدوای بەڵگەدا[٢]، لە کتێبی (الشفاء)دا دەڵێت: "لە ڕووەکانی ئیعجازی قورئان ئەوەیە چەندین زانست و زانیاریی وەهای کۆ کردووەتەوە، کە عەرەب نەیانزانیوە، هیچ یەکێکیش لە زانایانی نەتەوەکانی تریش پەییان پێ نەبردووە، لە هیچ یەکێک لە کتێبەکانیاندا نەهاتووە و باس نەکراوە."

لەو زانستانەش کە لە دووتوێی قورئاندا کۆکراونەتەوە:

ڕوونکردنەوەی زانستیی ڕێسا و حوکمە شەرعییەکان و سەرنجڕاکێشان بۆ لای ڕێڕەو و شێوازەکانی بەڵگەی ئەقڵی و وەڵامدانەوەی گرۆ و تاقمی نەتەوەکانی تر بە چەندین بەڵگەی بەهێز و سەلماندنی جۆراوجۆر، لەوانە: وەکو خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلاَّ اللَّهُ لَفَسَدَتَا فَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ (الأنبياء: ٢٢)، واتە: "ئەگەر لە ئاسمان و زەویدا چەند خوایەکی تر هەبووایە جگە لە ﴿اللَّهُ﴾، ئەوا وێران دەبوون و تێک دەچوون بەسەر یەکدا."هەروەها خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ بَلَى وَهُوَ الْخَلاَّقُ الْعَلِيمُ﴾ (يس:81) واتە: "ئایا ئەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زەویی دروست کردووە، ناتوانێت دووبارە وەک خۆیان دروستیان بکاتەوە؟" هەروەها قورئان چاوی خەڵکی کردووەتەوە لە ئاستی پلەوپایە و بایەخی زانستەکاندا، بەوەی کە زانستی شوبهاندووە بە ڕووناکی و بە ژیان، وەک دەفەرموویت: ﴿لِيُنْذِرَ مَنْ كَانَ حَيًّا

---

[٢] ڕاستە بانگەشەی قورئان بۆ تێڕوانین و گەڕان بە دوای بەڵگەدا؛ یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی قورئان، کە لە پەرتووکە ئاسمانییەکانی تری جیا دەکاتەوە و قورئان لەم ڕووەوە باڵاتر و زاڵترە لەوان، بەڵام دانانی ئەم بابەتە لەژێر ناونیشانی (ئیعجازی زانستی)دا؛ ڕەنگە وردەکاریی تیا نەبێت و پراوپڕ نەبێت. پیاچوونەوەی (د. إبراهيم الخولي) (الهيئة)

**وَيَحِقَّ الْقَوْلُ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾** (يس: ٧٠) واتە: "ئەم قورئانە بۆ ئەوەیە ئەو کەسانە بێدار بکاتەوە کە زیندوون (دڵ و ئەقڵیان زیندوو و هۆشیارە)."

**﴿يُخْرِجُهُمْ مِنْ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمْ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُمْ مِنْ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾**

(البقرة: ٢٥٧) واتە: "(خوای گەورە) لە تاریکییەکانی (بێباوەڕی و گومان و ستەم) دەریاندەهێنێت و دەیانبات بەرەو ڕۆشنایی و ڕووناکی (باوەڕ و ڕێنمایی)."

**﴿وَتِلْكَ الأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَا إِلاَّ الْعَالِمُونَ﴾ (العنكبوت: ٤٣)**

واتە: "ئەو نموونانە دەهێنینەوە بۆ خەڵکی، تەنیا زانا و شارەزاکان تێیدەگەن و تێدەفکرن."

**﴿هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُوا الأَلْبَابِ﴾**

**(الزمر: ٩)** واتە: "ئایا ئەو کەسانەی کە دەزانن و شارەزان، وەک ئەوانەن کە هیچ نازانن و شارەزاییان نییە؟"

بەڵکو ئەم جۆرە ئیعجازە، زۆر بەتەواوی و بەڕوونی قورئان لە شێوازەکان و مەبەستەکانی هەڵبەست و هۆنراوە جیا دەکاتەوە.

جا کاتێک پێشەوا (شاتیبی) لە پەرتووکی (الموافقات)دا دەڵێت: "واتاکانی قورئان بەوە نەبێت، کە عەرەب زانیویانە، لێک نادرێتەوە و جگە لەو مانایانەی لای ئەوان زانراو بوون؛ هیچی تر هەڵناگرێت"؛ لەوانەیە ئەم قسەیەی بۆ ئەوە کردبێت، تاوەکو لەو گرفتانە ڕزگاری بێت، کە لە سەروبەندی ڕەخنە و نکوڵی کردنی بێباوەڕاندا دێنە ئاراوە و مەسەلەکە لە کورتی ببڕێتەوە و باسەکە درێژە نەکێشێت و کاتی بە نرخی لەکیس نەچێت، ئەگەرنا چۆن پێشەوا (شاتیبی) نکوڵی لەوە دەکات، کە ئیعجازی قورئان بۆ خەڵکی هەموو سەردەمەکانە -نەک تەنیا بۆ سەردەمی هاتنەخوارەوەی- هەروەها چۆن پەیبردن بە ئیعجازی قورئان لەلایەن خەڵکانی دوای سەردەمی عەرەبییەوە، بەتەنیا لەوەدا کورت دەکاتەوە، کە

ئەوانیش هەر ئەوە بکەن بە بەڵگەی ئیعجازی قورئان کە خەڵکی سەردەمی هاتنەخوارەوەی قورئان (عەرەبەکان) دەستەوسان بوون لە ئاستیدا و نەیانتوانیوە بەرەنگاری ببنەوە[1].

کاتێک ئێمە دان بەوەدا دەنێین کە ئەوان (واتە عەرەبەکان) باڵا دەست بوون لە ڕەوانبێژی و زمانپاراویدا، ئەمە بۆخۆی ئیعجازێکی سەلمێنەرە کە خەڵکانی سەردەمێک لەبەرامبەر قورئاندا دەستەوسان بوون، بەڵام دەرکپێکردنی خەڵکی بە ئیعجازی قورئان لە سەردەمێکدا، سوودی نییە بۆ خەڵکانی سەردەمەکانی تر.

پاشان (إبن عاشور) ئەم فەرموودەیە وەک بەڵگەیەک بۆ بۆچوونەکانی دەهێنێتەوە: ((ما من الأنبياء نبي إلا أوتي - أو أعطي - من الآيات ما مثله آمن عليه البشر، وإنما كان الذي أوتيت وحيا أوحاه الله، فأرجو أن أكون أكثرهم تابعا يوم القيامة[2])).[3]

لە ڕاستیدا پەیوەندیی نێوان ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر) نیگای پێ بەخشراوە لەگەڵ ئەوەدا کە خوازیارە شوێنکەوتووی لە هەموو پێغەمبەرانی تر (سڵاوی خوایان لەسەر) زیاتر بێت، ئەم پەیوەندییە دەرناکەوێت و ئاشکرا نابێت، تەنیا بەوە نەبێت کە ئەو موعجیزەیەی پێی بەخشراوە -کە نیگاکەیە- موعجیزەیەکی گونجاو و شیاو بێت بۆ هەموو چەرخەکان، تاوەکو ئەوانەی بە هۆی موعجیزەکەیەوە شوێنی ئایینەکەی دەکەون؛ نەتەوە و گەلانێکی زۆر بن و سەرەڕای جیاوازیی ژیری و بەهرەیان؛ پێی قایل بن، بێگومان ئەوکات

---

[1] بە واتایەکی تر: ناگونجێت دەستەوسانبوونی عەرەبەکانی سەردەمی هاتنەخوارەوەی قورئان لەوەدا کە نەیانتوانیوە لە وێنەی قورئان دابهێنن، بکرێت بە تاکە وێنە و لایەنی ئیعجازیی قورئان بۆ هەموو خەڵکانی سەردەمەکانی تریش و هەموو ئیعجازی قورئان لەوەدا کورت بکرێتەوە تا دنیا دنیایە. (وەرگێڕ)

[2] واتای ئەم فەرموودەیە پێشتر باسکرا.

[3] ئەم فەرموودەیە -لە صەحیحی بوخاریدا- لە سەرەتای (فضائل القرآن)دا، فەرموودەی ژمارە ٤٩٨١ و هەروەها لە بەشی (الإعتصام)، بابی ٢، فەرموودەی ژمارە ٧٢٧٤، لە صەحیحی موسلیمیشدا لە (كتاب الإيمان)، بابی ٦٩، فەرموودەی ژمارە ١٥٢/٢٣٩، (النسائي)یش لە بەشی (التفسير) و (فضائل القرآن)دا گێڕاویەتیەوە، هەروەکوو (المزي) لە پەرتووکی (الأطراف)دا وتوویەتی: هەموویان لە (أبي هريرة)ەوە گێڕاویانەتەوە. (الهيئة)

ئەو لە هەموو پێغەمبەرانی تر (سڵاوی خوایان لەسەر) شوێنکەوتووی زیاتر دەبێت.

بەدڵنیاییەوە ئەمەش بەدی هاتووە، چونکە مەبەست لە "شوێنکەوتوو" ئەو کەسەیە کە بەتەواوی لە پەیڕەویکردنی ڕاستییەکانی ئاییندا شوێنی کەوتبێت، نەک تەنیا بە لافلێدان و پەیوەستبوونی زارەکی بێت.

ئەم لایەنەش لە ئیعجازی قورئان؛ بە کۆی قورئان و هەر هەمووی بەتێکڕایی دێتە دی و دەسەلمێت، چونکە هیچ ئایەتێک لە ئایەتەکانی بەتەنیا و هیچ سوورەتێکیش لە سوورەتەکانی بەجیا؛ ئەم جۆرە ئیعجازەیان لەخۆ نەگرتووە، بەڵکو لە کۆی هەموو ئایەت و سوورەتەکانەوە سەرچاوە دەگرێت.

لەبەر ئەوە ئەم جۆرەیان بریتییە لە ئیعجازێک کە لە کۆی قورئانەوە وەردەگیرێت و بەدەست دێت، ناشکرێت تەحەددای پێ بکرێت تەنیا بە ئاماژەپێدان نەبێت، وەکو ئەو ئایەتەی کە دەفەرموویێت: ﴿**أَفَلاَ يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلاَفًا كَثِيرًا**﴾ (**النساء: ٨٢**) واتە: "خۆ ئەگەر ئەو قورئانە لەلایەن کەسێکی ترەوە بووایە جگە لە خوا، ئەوا بێگومان جیاوازی و دژیەکییەکی زۆریان تێدا دەدۆزییەوە."

مامۆستا (إبن عاشور) لە پێشەکیی چوارەم لە تەفسیری (التحرير والتنوير)، لە بەرگی ١، لاپەڕە (٤٢-٤٥) دەڵێت: " لە شێوازی سێهەمدا: چەندین بابەتی زانستی لەو زانستانەی پەیوەندییان بە مەبەستی ئایەتەکەوە هەیە؛ دێتە ئاراوە، بەگوێرەی ئەوەی کە مانای ئایەتەکە ئەگەر بە هێمایەکیش بێت؛ ئاماژەی بۆ کردوون[١]، وەکو ئەوەی کەسێک لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿**يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلاَ أُوْلُوا الأَلْبَابِ**﴾ (**البقرة: ٢٦٩**)، باس لە بەشەکانی زانستی دانایی (الحكمة) و سوودەکانی بکات

---

[١] یان بەگوێرەی چەند شێوەیەکی تر، کە لە بڕگەکانی داهاتوودا باس دەکرێن. (وەرگێڕ)

و بیخاتە ژێر واتای (خیرا کثیرا)وە، ئەگەرچی زانستی دانایی؛ زانستێکی زاراوەییە و واتاکەی بەتەواوی پڕاوپڕ نییە لەگەڵ مانای ئایەتەکەدا؛ بەڵام بە باسکردنی لە کاتی تەفسیری ئایەتەکەدا واتای بنەڕەتی و ڕەسەنی ئایەتەکە لەدەست ناچێ و فەرامۆش ناکرێت، لە هەمان کاتیشدا لق و بەشەکانی دانایی یارمەتیدەرن بۆ باسکردنی.

بە هەمان شێوە ئەگەر لە ئایەتی: ﴿مَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ كَيْ لاَ يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الأغْنِيَاءِ مِنْكُمْ وَمَا آتَاكُمْ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ (الحشر: 7) هەندێ لە بابەت و باسەکانی زانستی ئابووریی ڕامیاری و دابەشکردنی سامانی گشتی وەربگرین و هەر بە هەمان ئایەت؛ دروستیی زەکات و میراتگری و مامەڵە ئاوێتەکان لە سەرمایە و کار لێک بدەینەوە، بەگوێرەی ئەوەی کە ئایەتەکە بە شێوەی ئاماژە باسی کردوون.

لەوانەیە هەندێ لە بابەتە زانستییەکان، پەیوەندییەکی زیاتر و بەهێزتریان هەبێت بە تەفسیرکردنی هەندێ لە ئایەتەکانی قورئانەوە، وەک ئەوەی کە مەسەلەیەکی ژیربێژی دەکەین بە بنەما بۆ سەلماندنی بەڵگەیەکی قورئانی، بۆ نموونە؛ بەکارهێنانی بەڵگەی "ڕێبەیەکنەدان" یاخود "ڕێگری لە یەکتر" (برهان التمانع[1]) بۆ سەلماندنی مانای ئایەتی: ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلاَّ اللَّهُ لَفَسَدَتَا فَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ (الأنبياء: ٢٢)، واتە: "ئەگەر لە ئاسمان و زەویدا، جگە لە خوا؛ چەند پەرستراوێک هەبوونایە، بێگومان هەردووکیان تێک

[1] نازانم: تێروانین بە کوێ دەگات، لە کاتێکدا مەنتیقییەکان پێناسەی بەڵگەی (التمانع) دەکەن، هەروەها ئەرستۆ پێناسەی کردووە و (جاحظ) و (إبن المعتز)یش بە ناوی "ڕێبازی عەقڵی: المذهب الكلامي" باسیان لێ کردووە! پیاچوونەوەی (د. إبراهيم الخولي) (الهيئة).

دەچوون." هەروەها وەکو بڕیاردانی مەسەلەی هاوشێوە (المتشابە) بۆ بەدیهێنانی واتایەک، وەک لە ئایەتی: ﴿وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْيدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴾ (الذاريات: ٤٧) واتە: "ئێمە ئاسمانمان بە دەستی خۆمان دروست کردووە و هەر ئێمەش فراوانی دەکەین."

بوونی ئەم جۆرە باس و بابەتانە بە بەشێک لە مەبەستەکانی تەفسیر، شتێکی ڕوون و ئاشکرایە.

بە هەمان شێوە ئایەتی: ﴿أَفَلَمْ يَنْظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِنْ فُرُوجٍ﴾ (ق: ٦)، واتە: "ئایا ورد نەبوونەتەوە لەو ئاسمانەی وا بەسەریانەوە، چۆن دروستمان کردووە و ڕازاندوومانەتەوە بە جۆرێک هیچ کەموکوڕییەک و کەلێنێکی تێدا نییە!"

دیارە کە مەبەست لەم ئایەتە؛ ڕەچاوکردنی حاڵەتە بینراوەکەیە، جا ئەگەر تەفسیرنووس زیاتر باسی لە وردەکاریی ئەو حاڵەتە کرد و نهێنییەکان و هۆیەکانی بەپێی ئەوەی لە زانستی گەردوونناسیدا باس کراوە؛ شی کردەوە، ئەوا بەم کارەی خزمەتێکی زیاتری بە ڕوونکردنەوەی مەبەستی ئایەتەکە کردووە. ئەمەش لەو ڕووەوە کە گونجان و وەک یەک بوون لەنێوان واتا قورئانییەکە و مەسەلە زانستییە ڕاستەکاندا دەربکەوێت، ئەگەر گونجا بەیەکەوە کۆ بکرێنە و یەکبخرێن، یان لەو ڕووەوە کە لە واتای فراوانی ئایەتەکەوە وەربگیرێت هەروەکو لە ئایەتی: ﴿وَيَوْمَ نُسَيِّرُ الْجِبَالَ﴾ (الكهف: ٤٧) واتە: "یادیان خەرەوە، ڕۆژێک کە شاخەکان دەخەینە ڕێ." ئەوەی لێ وەربگیرێت کە لەناوچوونی جیهان لە ڕێی ڕوودانی بوومەلەرزەوە دەبێت.

هەروەها لە ئایەتی: ﴿إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾ (التكوير: ١) واتە: "کاتێک خۆر پێچرایەوە و (ڕووناکییەکەی نەما)." ئەوەی لێ وەربگیرێت، کە یاسای کێشکردن لە کاتی لەناوچوونی جیهاندا تێک دەچێت. بەڵام دەبێت ئەوە بزانرێت، کە مەرجی

قبوولکردنی ئەم شێوازە[1] ئەوەیە -کە تەفسیرنووس- بە شێوەیەکی کورت و پوخت لێی بدوێت و تەنیا پوختەیەکی ئەو بابەتە زانستییە باس بکات و نابێت درێژەدان بەو باسانە؛ ببێتە مەبەستی تەفسیرنووس و لە بنەڕەتی بابەتی ئایەتەکە لا بدات، بۆ ئەوەی بەر واتای ئەو پەندە نەکەوێت کە دەڵێت: "نموونە بە هۆی نموونەیەکی ترەوە باس دەکرێت."

زانایان سەبارەت بە گرتنەبەری ئەم شێوازە[2] بەتێکڕایی چەند ڕایەکیان هەیە: کۆمەڵێکیان ئەوەیان پێ باشە، کە گونجاندن لەنێوان زانستە نائاینییەکان و ئامرازەکانیاندا لە لایەک و واتا قورئانییەکان لە لایەکی ترەوە، بەدی بهێنرێت و پێیان وایە کە قورئان ئاماژەی بۆ زۆرێک لەو زانستانە کردووە، بۆ نموونە، (ابن رشد الحفید)، کە ناوی (محمد بن أحمد بن رشد)ە و لە ساڵی (١١٩٨ز) کۆچی دوایی کردووە، لە پەرتووکی (فصل المقال)دا دەڵێت: "مسوڵمانان لەسەر ئەوە یەک دەنگن کە نابێت زاراوە شەرعییەکان هەر هەموویان بەپێی واتا دیار و ڕووکەشەکان لێک بدرێنەوە، هەروەها ناشبێت هەر هەموویان لەو واتا ئاشکرایانە لا بدرێن و بە واتا شاراوەکان شی بکرێنەوە (تأویل)."

هۆی ئەوەش کە لە شەرعدا واتای ئاشکرا و واتای شاراوە هەیە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی، کە تێڕوانینی خەڵکی جیاوازە و ئاستی ژیری و تێگەیشتنیان لە باوەڕپێکردندا وەک یەک نییە، پاشان پوختەی قسەکانی گەیشتووە بەوەی کە پەیوەندییەک لەنێوان زانستە شەرعییەکان و فەلسەفییەکاندا هەیە.

چەند زانایەکی تریش هەمان بۆچوونی ئەمیان هەیە، لەوانە: (قطب الدين الشيرازي) لە پەرتووکی (شرح حكمة الاشراق) و پێشەوا (غەزالی) و پێشەوا (ڕازی) و (أبوبكر بن العربي) و چەندین زانای تر؛ بەرهەمەکانیان لەم ڕووەوە ئەوە دەخوازێت، کە ڕوونکردنەوە و گونجاندنی مەسەلە زانستییەکان کارێکی

---

[1] واتە باسکردنی بابەتە زانستییە پەیوەندیدارەکان لە کاتی تەفسیری ئایەتەکاندا.

[2] واتە شێوازی سێهەم، وەک لە سەرەتای قسەکانیەوە ئاماژەی پێ کردووە.

پەسەندە، چونکە لە بواری لێکدانەوەی مانا قورئانییەکاندا؛ کتێبەکانیان پڕ کردووە لە بەڵگەهێنانەوە بە ڕێساکانی زانستەکانی دانایی[1] و زانستەکانی تریش.

هەمان شتیش لە شێوازی فەقیهەکاندا لە کتێبەکانی (أحكام القرآن)دا بەدی دەکرێت، هەروەک پێشتریش لە قسەکانی (ابن العربي) لە بارەی (سوورەتی نوح) و چیرۆکی (الخضر)ەوە دەرکەوت، هەروەها (ابن جني) و (الزجاج) و (أبو حيان)یش تەفسیرەکانیان پڕ کردووە لە بەڵگەهێنانەوە لەسەر ڕێساکانی زمانی عەرەبی.

گومانیش لەوەدا نییە، کە واتای ئەو فەرمایشتانەی لەلایەن خوای زانا و ئاگادار بە پەنهانەکانەوە هاتووە؛ بەتەنیا لەسەر تێگەیشتنی یەک کۆمەڵ یان دەستەیەک بنیات نانرێت و لێک نادرێتەوە، بەڵکو واتاکانیان لەگەڵ ڕاستییە نەگۆڕەکاندا یەکانگیر دەبنەوە و لە هەر زانستێک لە زانستەکاندا هەر مەسەلەیەک، یان بابەتێک گەیشتە پلەی ڕاستیی نەگۆڕ و ئایەتەکەش پەیوەندیی هەبوو لەگەڵیدا، ئەوا بە ئەندازەی ئەوەی تێگەیشتنی مرۆڤەکان پێی گەیشتووە و لە داهاتووشدا پێی دەگات؛ ئەو ڕاستییە زانستییە دەچێتە چوارچێوەی واتا و مەبەستی ئایەتەکەوە.

ئەمەش بەگوێرەی جیاوازیی ئاستەکان دەگۆڕێت و لەسەر بنەمای تێگەیشتن بنیات دەنرێت، بەڵام مەرجە ئەم لێکدانەوەیە بە جۆرێک بێت لە سنووری ئەو واتایانە نەچێتە دەرەوە، کە زاراوە عەرەبییەکە دەیانگرێتەوە، بە بەڵگەش نەبێت هیچ کات لە مانا دیار و ئاشکراکان دوور نەخرێتەوە، هەروەها بەزۆر سەپاندنی پێوە دیار نەبێت، یان لە مانا بنەڕەتییەکەی نەبرێتە دەرەوە، بۆ ئەوەی وەکو تەفسیری (باتنییەکان)ی لێ نەیەت.

---

[1] بەڵام ئێستا پرسیار ئەوەیە: ئایا بایەخی ئەو ڕێسایانەی زانستەکانی دانایی و ئەوانی تریش کە کتێبەکانیان پێ ئاخنیوە، چییە و سەرەنجامیان لە ڕوانگەی زانستەوە لە مرۆڤدا بە چی گەیشتووە! پیاچوونەوەی (د. إبراهيم الخولي) (دەزگا) ئەم پەراوێزە گونجاو نییە، چونکە لە سەرەوە باس لە بەڵگەی زانستی کراوە، کە هیچ کات گۆڕانی بەسەردا نایەت، نەک بابەتە زانستییەکان کە دەکرێ گۆڕانیان بەسەردا بێت. (م. فارووق)

(پێشەوا شاتیبی) لە بەشی سێهەمی مەسەلەی چوارەمدا وتوویەتی: "لە ڕێبازی تێگەیشتن و تێگەیاندندا؛ تەنیا ئەوە ڕاست و دروستە کە لە ئاستێکی گشتیدا بێت بۆ هەموو عەرەب، لەبەر ئەوە نابێت لە لێکدانەوەیدا[1] بەزۆر شتێک بسەپێنرێت کە لەسەرووی ئاست و توانای تێگەیشتنی ئەوانەوە بێت."

(ابن عاشور) لە مەسەلەی چوارهەمی جۆری دووەمدا ئەم قسەیەی (شاتیبی)، کە ئێستا باسمان کرد، دەهێنێتەوە و بەم شێوەیە لەسەری دەدوێت: "ئەم بۆچوونەی لەسەر ئەو بنچینەیە بنیات ناوە کە پێی وایە: لەبەر ئەوەی قورئان پەیامێک بووە بۆ نەخوێندەوارەکان -عەرەبەکانی ئەو کاتە- کەوابوو توانا و وزەی ئەوان کراوە بە پێوەر و ڕەچاوی ئاستی ئەوان کراوە لە ڕێبازی تێگەیشتن و تێگەیاندنی قورئاندا، ئەمەش وا دەگەیەنێت شەریعەتیش لەو ئاستەدا بێت و تەنیا شەریعەتی نەخوێندەواران بێت!"

(إبن عاشور) پێی وایە کە بنچینەی قسەکانی (شاتیبی)، بنچینەیەکی لاوازە و لە شەش ڕووەوە باس لە لاوازییەکەی دەکات:

**یەکەم:** ئەو بناغەیەی، کە قسەکانی لەسەر بنیات ناوە؛ وا دەخوازێت قورئان شتێکی تیا نەبێت، کە عەرەب لە بارێکەوە بگۆرێت بۆ بارێکی تر، ئەمەش شتێکی نادروستە بەگوێرەی ئەوەی پێشتر باسمان کرد. خوای گەورەش دەفەرموێت: **﴿تِلْكَ مِنْ أَنْبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهَا إِلَيْكَ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَا أَنْتَ وَلاَ قَوْمُكَ مِنْ قَبْلِ هَذَا فَاصْبِرْ إِنَّ الْعاقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ﴾ (هود: ٤٩)** واتە: "ئەی (محەمەد - دروودی خوای لەسەر) ئەو باسانەی بۆمان کردیت؛ ئەوانە لە هەواڵە پەنهانەکانن کە بە نیگا بۆت دەنێرین، نە تۆ و نە گەلەکەت پێش ئەم باسکردنەی ئێمە نەتاندەزانین."

ئەم ئایەتەش بەڕوونی و بەئاشکرا ئەوە دەگەیەنێت، کە قورئان زۆر ڕاستیی لەخۆ گرتووە کە گەلەکەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) نایزانن و بێئاگان لێی، لە چەشنی هەواڵەکانی پەنهان و موعجیزەکان.

---

[1] واتە لێکدانەوەی قورئان. (وەرگێڕ)

دووەم: واتا و مەبەستەکانی قورئان دەگەڕێنەوە بۆ ئەو بنەمایەی، کە بانگەوازەکەی بانگەوازێکی گشتگیرە[١]، خودی قورئانیش موعجیزەیەکی بەردەوامە، لەبەر ئەمە پێویستە کۆمەڵە واتا و مەبەستێکی وەهای لەخۆ گرتبێت، لەگەڵ ژیری و تێگەیشتنی ئەو خەڵکانەشدا بگونجێت کە دواتر لە سەردەمانێکدا دێن کە سەردەمی بڵاوبوونەوەی زانستەکانە لەنێو خەڵکیدا.

(ابن عاشور) لە جێگەیەکی تری تەفسیرەکەیدا -بەرگی ١، لاپەڕە ١٠٤- دەڵێت: "لە ڕاستیدا ڕووەکانی ئیعجازی قورئان دەگەڕێنەوە بۆ سێ لایەن...لایەنی سێهەم: بریتییە لەوەی کە قورئان چەندین واتای دانایی (فەلسەفی) و ئاماژەی جۆراوجۆری بۆ ڕاستییە عەقڵی و زانستییەکان لەخۆ گرتووە، کە ژیریی مرۆڤەکان لە سەردەمی هاتنەخوارەوەی قورئان و تەنانەت لە چەندین سەردەمی جیاوازی دواتریش دەرکیان پێ نەکردووە و پێی نەگەیشتوون. ئەم لایەنە ڕوویەکە لە ڕووەکانی ئیعجازی قورئان، کە زانایانی خۆیشمان؛ ئەوانەی دەربارەی ئیعجازی قورئان دواون لە نموونەی (أبوبكر الباقلاني) و (القاضي عياض) لە نووسینەکانیاندا فەرامۆشیان کردووە و باسیان لێ نەکردووە.

ئەم ڕووەش لە ئیعجازی قورئان -کە لایەنی سێهەمە-؛ ئەوە دەسەلمێنێت، کە ئیعجازی قورئان سەرتاپای مرۆڤەکان دەگرێتەوە و بە درێژایی گوزەری چاخەکانیش بەردەوام دەبێت، ئەمەش دەچێتە چوارچێوەی ئەو قسانەوە، کە پێشەوایانی ئایینی سەبارەت بە قورئان وتوویانە کە: "قورئان موعجیزەیەکی بەردەوامە و بە درێژایی تێپەڕبوونی ساڵەکان هەر دەمێنێت"، چونکە ئاستی ئیعجازەکەی بە چەشنێکە تەنانەت کەسانی خاوەن ژیری لە غەیری نەتەوەی عەرەبیش درکی پێدەکەن، ئەویش لە ڕێی وەرگێڕانی واتاکانیەوە، کە هەموو بوارەکانی یاسادانان و دانایی و زانست و ڕەوشتیش لەخۆ دەگرن، بەمەش لە لایەکەوە، دەبێت بە بەڵگەیەکی ڕوونکردنەوەی وردەکاری بۆ کەسانی تایبەتمەند

---

[١] واتە: بۆ هەموو خەڵکییە و بۆ هەموو شوێن و سەردەمێکە، کە وا بوو دەبێت مەبەستەکان بەو جۆرە بن کە لەگەڵ ئەم گشتگیرییەدا بگونجێن. (وەرگێڕ)

لەو بوارانەدا، لە لایەکی تریشەوە، بەڵگەیەکی تێکڕاییە بۆ هەر کەسێک کە شایەتیی ئەو تایبەتمەندانەی لە بارەیەوە پێ بگات (تەماشای تەفسیری (إبن عاشور) بکە، بەرگی ١، لاپەڕە ١٢٧-١٢٨).

**سێهەم:** پێشینان وتوویانە[١]: سەرسوڕهێنەکانی قورئان کۆتاییان نایەت و لەبن نایەن، مەبەستیشیان لە شتە سەرسوڕهێنەکان؛ واتاکانیەتی، جا ئەگەر بەگوێرەی قسەکانی پێشەوا (شاتیبی) بێت؛ ئەوا دەبووایە شتە سەرسوڕهێنەکانی قورئان کۆتاییان بهاتایە، چونکە قسەکانی ئەو وا دەخوازێت، کە جۆری واتاکانی قورئان سنووردار بن.

**چوارەم:** لە نیشانەی تەواوەتیی ئیعجازی قورئان ئەوەیە کە: سەرەڕای کورتیی دەربڕینەکانی، هێندە واتای فراوان و گشتگیر لەخۆ بگرێت، کە ناتوانرێت بە چەندین کتێب و نووسراوی زۆروزەبەندەش -بە وێنەی قورئان- هەقی خۆی بدرێتێ.

**پێنجەم:** ڕەچاوکردنی ڕادە و ئاستی تێگەیشتنی ئەو کەسانەی سەرەتا قورئان دواندوونی و بانگی کردوون؛ تەنیا ئەوەندە دەخوازێت، کە مانای بنەڕەتیی قورئان لایان ڕوون و ئاشکرا بووبێت و لێی تێگەیشتبن، ئیتر هەرگیز ئەوە ناگەیەنێت کە مانایەکی تر زیاد لەوەی ئەوان تێیگەیشتوون؛ نەگرێتەوە؛ بەڵکو دەشێت سەرەڕای واتا بنەڕەتییەکان؛ واتای زیاتریشی هەبێت، بەڵام ڕەنگە کەسانێک لەو ئاستەدا بن کە لێی تێبگەن و لای کەسانێکی تریش شاراوە بێت و نەتوانن پەی پێ بەرن، هەروەک لە فەرموودەدا هاتووە: ((ورب حامل فقه الی من

---

[١] لە ڕاستیدا ئەمە وتەی پێشین نییە، بەڵکو ئەم وەسفە بەشێکە لەو فەرموودەیەی، کە (الحارث الأعور) لە ئیمامی (علي)ەوە دەیگێڕێتەوە و ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر) گێڕاویەتیەوە، بەڵام سەنەدەکەی لاوازە. بڕوانە (التاج الجامع للأصول): کتاب فضائل القرآن، هەروەها (سنن الترمذي)، کتاب فضائل القرآن.

هو أفقه منه[١]))، واته: "لەوانەیە کەسێک هەڵگری فیقهێک بێت و بیگەیەنێت بە کەسێکی دی کە لە خۆی باشتر لێی تێبگات[٢].

**شەشەم:** وتراوە: "گوایە پێشین لەم بابەتانە نەدواون و قسەیان لەسەر نەکردوو." دەکرێت لەم بارەیەوە بڵێین: ئەگەر مەبەست ئەوەیە، کە ئەوان قسەیان لەو بابەتانە نەکردووە، کە ناگەڕێنەوە سەر واتاکانی قورئان و خزمەتی مەبەستە قورئانییەکان ناکەن، ئەوا ئێمەش هاوڕاین و پشتگیریی ئەم بۆچوونە دەکەین، ئەگەر مەبەستیش ئەوە بێت، کە ئەوان لەو بابەتانە نەدواون، کە پەیوەندییان بە مەبەستە قورئانییەکانەوە هەیە، ئەوا ئێمە دان بەوەدا نانێین و پێمان وا نییە ئەوان تەنیا لە سنووری واتای دیار و ڕووکەشی ئایەتەکاندا وەستابن، بەڵکو لە بواری چەندین زانستدا کە جێی بایەخیان بوون؛ چەندین شتیان ڕوون کردووەتەوە و لە وردەکارییەکان دواون و لق و بەشی جۆراوجۆریان لێ کردووەتەوە، ئەمەش ڕێمان لێ ناگرێت کە ئێمەش شوێنپێی ئەوان هەڵبگرین لە بواری کۆمەڵە زانستێکی تردا کە بە هەمان شێوە خزمەت بە مەبەستەکانی قورئان دەکەن یان فراوانیی زانستە ئیسلامییەکان دەردەخەن. هەر باسێکی تریش لەمانە ترازا، ئەگەر لە پێناو ڕوونکردنەوەی واتاکەدا بوو؛ ئەویش هەر سەر بە تەفسیرەکەیە و دەچێتە چوارچێوەی تەفسیرەوە، چونکە زانستە عەقڵییەکان لە حاڵەتی شتەکان دەکۆڵنەوە، بەو شێوەیەی کە خۆیان تیایدان و وەک ئەوەی کە هەن.

بەڵام ئەگەر باسەکە لەمەش تێپەڕی و زیاتر بوو لە پێویستیی ڕوونکردنەوەی واتاکان؛ ئەوا ناچێتە چوارچێوەی تەفسیرەوە، بەڵکو بریتی دەبێت لە بابەتێکی تەواوکەر بۆ باسە زاننستییەکان و درێژەپێدانێکە لە باسی زانستێکدا

---

[١] ئەم ڕستەیە بەشێکە لە فەرموودەیەکی درێژ کە (عمرو بن الآحوص) لە پێغەمبەری خواوە (درووودی خوای لەسەر) گێڕاویەتیەوە کە لە وتاری حەجی ماڵئاواییدا فەرموویەتی. (إبن ماجة) لە (المناسک: باب ٧٦، حدیث رقم ٣٠٥٦) گێڕاویەتیەوە. (دەزگا)

[٢] واتە وەرگرەکە لە گەیەنەرەکە باشتر لەو بابەتە حاڵی دەبێت کە گەیەنەرەکە هەڵیگرتووە و بۆی هێناوە.

که پەیوەندیی بە بابەتی تەفسیرەکەوە هەیە و بۆ ئەوەیە خوێنەری تەفسیر بە شێوەیەکی فراوانتر بەهرەمەند بێت لە زانستە جۆراوجۆرەکان.

پاشان (ابن عاشور) دەڵێت: منیش دەڵێم: پەیوەندیی زانستەکان بە قورئانەوە چوار پلەی هەیە:

**یەکەم:** ئەو زانستانەیە کە قورئان لەخۆی گرتوون، وەک هەواڵ و باسی پێغەمبەران و نەتەوەکان، خاوێنکاری و پوختەکردنی ڕەوشتەکان، هەروەها زانستەکانی فیقهـ یاسادانان، بیروباوەڕ، بنچینەکانی فیقهـ زمانی عەرەبی و ڕەوانبێژی.

**دووەم:** ئەو زانستانەن کە زانیارییەکی زیاتر دەبەخشن بە موفەسیری قورئان، وەک زانستەکانی فەلسەفە و گەردووونناسی و تایبەتمەندێتیی دروستکراوەکان.

**سێیەم:** ئەو زانستانەی کە قورئان ئاماژەی بۆ کردوون یان باسەکانی ئەوان پشتگیری لە واتاکانی قورئان دەکەن، وەک زانستی زەمینناسی و پزیشکی و ژیربێژی.

**چوارەم:** ئەو زانستانەی کە هیچ پەیوەندییەکیان بە قورئانەوە نییە، لەبەر ئەوەی کە. شتی پڕوپووچ و بەتاڵن وەک لافلێدانی پەنهانزانی و خوێندنەوەی ئایندە و ئەفسانەزانی[1]، یان لەبەر ئەوەی ئەو زانستانە هیچ خزمەتێک بە قورئان ناکەن، وەکو زانستەکانی هۆنراوەزانی و سەروا[2] (بڕوانە تەفسیری التحرير و التنوير، بەرگی١، لاپەڕە ٤٥).

پاشان مامۆستا (ابن عاشور) لە پێشەکیی نۆهەم لە تەفسیرەکەیدا، بەرگی١، لاپەڕە ٩٤، باس لەوە دەکات، کە "ڕستەکانی قورئان هەر واتایەکیان لەخۆ گرتبێت، ئەوا ئەو واتایانە وەک مەبەستی قورئان دادەنرێن و تەماشا دەکرێن"، لەم بارەیەشەوە دەڵێت: بەگوێرەی ئەوەی قورئان لەلایەن ئەو زاتەوە دابەزیوە، کە زانیاریی تەواوی بە هەموو شتێک هەیە، لەبەر ئەوە هەر واتایەک لەگەڵ

---

[1] ئەفسانەزانی یان زانستی ئەفسانە: میثولوجیا

[2] علم العروض والقوافي (وەرگێڕ)

داڕشتنە پاراو و ڕەوانەکانیدا بگونجێت و لە هەمان کاتدا، یەکێک بێت لەو واتایانەی عەرەبەکان پێی ئاشنان لە نموونە هاوشێوەکانی ئەو داڕشتنانەدا؛ ئەوا دەکرێت ئەم واتایە وەک لێکدانەوەیەکی پەسەند بۆ مەبەستی پەروەردگار لەو دەقانەی ناردوویەتیە خوارەوە؛ دابنرێت، بە مەرجێک هیچ ڕێگرێکی ئاشکرا یان زاڵ، لە نموونەی بەڵگەیەکی شەرعی، یان زمانەوانی، یان تەوقیفی لە ئارادا نەبێت، کە ڕێ لەوە بگرێت بەو جۆرە واتایە لێک بدرێتەوە.

ئاشکراشە خوای گەورە، قورئانی کردووە بە پەرتووکی هەموو ئوممەت، کە ڕێنمایی تیایە بۆیان و لە چەندین ئایەتیشدا پەروەردگار بانگی کردوون بۆ ئەوەی لێی ورد ببنەوە و لێی حاڵی ببن و هەوڵ و کۆشش بکەن بۆ دەرهێنانی واتاکانی. بەڵگەش لەسەر ڕاستی و دروستیی ئەم بنەڕەتەی، کە قسەکانمان لەسەر بنیات ناوە، بریتییە لەو تەفسیرانەی لەلایەن پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر) پێمان گەیشتوون.

لە هەندێ لەم تەفسیرانەدا واتای وەها دەبینین، کە دڵنیاین هەرگیز ناکرێت واتایەکی لەو جۆرە لەپێشترین واتا بێت بۆ ئەو داڕشتنەی لێوەی وەرگیراوە، بەڵام کاتێک بەوردی سەرنج دەدەین؛ ئەوسا دەزانین، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر) لەم جۆرە تەفسیرکردنەیدا تەنیا مەبەستی ئەوە بووە بیروهۆشەکان بەئاگا بێنێت و بیانبزوێنێت بۆ ئەوەی ئەوپەڕی واتا و مەبەستەکان لە دەستەواژەکانی قورئانەوە وەربگرن، لەم بارەیەشەوە (ابن عاشور) چەندین نموونەی جۆراوجۆری لە تەفسیرەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) هێناوەتەوە.

## ڕای مامۆستا (بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی)

مامۆستا لە هەموو بەشەکانی جیهانی ئیسلامیدا، وەک موجاهیدێک ناوبانگی بڵاوبووەتەوە و لە ڕاستییشدا ئەو بەو چەشنە بووە، بەڵام ئەم ڕاستییە نابێت وامان لێ بکات لایەنە زانستییەکەی مامۆستا فەرامۆش بکەین، چونکە مامۆستا بەڕەحمەت بێت ئەندام بووە لە (دار الحكمة الاسلامية)، کە گەورەترین دامەزراوەی زانستیی ئەو ڕۆژگارە بووە لە دوا ساڵەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا.

مامۆستا نوورسی تەفسیری سوورەتی (البقرة)ی بە عەرەبی نووسیوە، کە بە (إشارات الاعجاز في مظان الايجاز) ناو دەبرێت، ئەم تەفسیرەشی لە کاتێکدا داناوە کە خۆی و قوتابییەکانی دژ بە ڕووسەکان جەنگاون لە جەنگی جیهانیی یەکەمدا.

دوابەدوای ئەمە، ئەو کتێبانەی نووسیوە کە بە (سەرجەمی پەیامەکانی نوور) ناو دەبرێت و بەشی هەرە زۆری بە زمانی تورکی نووسیونی وبریتین لە تەفسیری هەندێ لە ئایەتەکانی قورئان و لە ساڵی ١٩٣٠ زایینیدا تەواوی کردوون[١].

پاشان مامۆستا (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، پاش تەمەنێکی ٨٥ ساڵی (١٨٧٦-١٩٦٠ز) پڕ لە زانست و جیهاد تا دوا هەناسە، لە ساڵی (١٩٦٠ز)دا کۆچی دوایی کردووە. لەم چەند پەڕەیەی داهاتوودا هەوڵ دەدەین بەشێک لە بیروبۆچوونەکانی مامۆستا سەبارەت بە گونجاندنی نێوان واتا قورئانییەکان و ڕاستییە دروستەکانی زانستە سروشتییەکان بگوڕین بۆ سەر زمانی عەرەبی و باسێکیان لە بارەوە بکەین.

---

[١] سەرجەمی پەیامەکانی نوور بۆ زمانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی وەرگێڕدراون، چەندین پەیامیشیان بۆ نزیکەی ٤٠ چل زمان لە جیهاندا. سەبارەت بە زمانی کوردییش، لەلایەن مامۆستای بەڕێز (فارووق ڕەسول یەحیا)ەوە کراون بە کوردی و بڵاوکراونەتەوە کە ئێستا لە کتێبخانەکانی کوردستاندا لەبەر دەستی خوێنەردان، هەروەها چەند پەیامێکی سەربەخۆی تریش، کە لە ساڵانی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا بەشێک بوون لە کتێبەکانی ڕابوونی ئیسلامی. (وەرگێڕ)

مامۆستا دەڵێت[1]: "لەگەڵ تێپەڕبوونی کات و پەرەسەندنی زانستەکاندا؛ بەشێک لە ئایەتەکانی قورئان زیاتر ڕوون دەبنەوە و واتاکانیان ئاشکرا دەبێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە قورئان گەنجینەیەکە؛ گەوهەرەکانی لە ژماردن نایەن و سەرسووڕهێنەکانی کۆتاییان نایەت و نابڕێنەوە.

بەشێک لە دەقەکانی چەسپاو و دامەزراوە و واتا و حوکمەکانیان لە هەموو سەردەمێکدا هەروەک خۆی دەمێنێتەوە و ناگۆڕێت، بەڵام هاوکات هەندێ واتای لاوەکییشی تێدایە، ئاماژە بۆ هەندێ لەو ڕاستییە زانستییانە دەکەن، کە بەگوێرەی پێشکەوتنی ئاستی زانستیی مرۆڤایەتی؛ بەرە بەرە ئاشکرا دەبن و دەردەکەون.

بەڵام ئەو ڕاستییە ئاشکرایانەی پێشینە چاکەکانی -ئەم ئوممەتە- ڕوونیان کردووەتەوە؛ هەموویان واتاگەلێکی دانپیانراو و پارێزراون و هەرگیز جێی گومان نین، چونکە بریتین لە کۆمەڵێ دەق و واتای سەلمێنراو و کۆمەڵە بنچینە و ڕێسایەکی وەها، کە پێویستە باوەڕیان پێ بهێنرێت. قورئانی پیرۆزیش بەوە وەسف کراوە، کە بە زمانێکی عەرەبیی ڕوون و ئاشکرایە: ﴿بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُبِينٍ﴾ (الشعراء: ١٩٥) ئەمەش وا دەخوازێت، کە واتا بنەڕەتییەکانی ڕوون و ئاشکرا بن.

فەرمایشت و پەیامەکەی خوای گەورەش هەر بەدەوری ئەم واتایانەدا دەسووڕێتەوە و بەهێز و ئاشکرایان دەکات.

هەر کەسێکیش نکوڵی لەو واتایانە بکات، کە دەقەکان دەستنیشانیان کردوون، وەک ئەوە وایە فەرمایشتەکانی خوای گەورە بەدرۆ بخاتەوە و تێگەیشتنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) لە قورئان بخاتە ژێر تۆمەت و گومانەوە. لەبەر ئەوە هیچ گومان لەوەدا نییە، کە ئەو واتایانەی لە دەقەکانەوە دەستنیشان کراون،

---

[1] ئەوەی (د. سوعاد) هێناویەتی؛ زیاتر بریتییە لە پوختەی قسەکانی مامۆستا تا ئەوەی وەرگێرانی دەق بێت، بۆ زیاتر سوودبینین لە دەقەکان؛ بە باشمان زانی لە کتێبەکانی مامۆستا (فارووق)ەوە وەریانبگرین و وەک پاشکۆیەک بۆ باسەکە بڵاوی بکەینەوە.

واتاگەلێکن لە چاوگی پەیامەکەوە وەرگیراون." بڕوانە (مکتوبات)، ٤٠٠-٤٠١، مەکتووبات بە کوردی، ٦٥٦.

پاشان مامۆستا دوای ئەوەی هەندێ مانای ئاماژەیی لە ڕووی ئیعجازی زانستییەوە دەخاتە ڕوو، دەپرسێت و دەڵێت:

ئەگەر بپرسیت و بڵێیت: ئێمە چۆن بزانین، کە قورئانی پیرۆز مەبەستی ئەم واتایانە بووە و ئاماژەی بۆ کردوون؟

لە وەڵامدا دەڵێین[1]: بەگوێرەی ئەوەی، کە قورئان نەخشەیەکی هەمیشەییە و باس و پەیامەکەی بۆ هەموو چینوتوێژە یەکلەدوایەکەکانی مرۆڤایەتییە تا ڕۆژی دوایی، لەبەر ئەوە پێویستە ڕەچاوی هەموو ئەو تێگەیشتنە جیاوازانە بکات و چەندین واتای جۆراوجۆر لەخۆ بگرێت و بیانخاتە چوارچێوەی مەبەستی خۆیەوە، هەروەها هاوشانی واتاکانیش چەندین مەزەندە و نیشانە دابنێت، کە ڕێنمایی مرۆڤ بکەن، بۆ ئەوەی کە ئەو واتایانە بەشێکن لە مەبەستەکانی قورئان.

بە شایەتی و یەکدەنگیی زانایانی موجتەهید و زانایانی تەفسیر و بیروباوەڕ و بنچینەکانی فیقهـ؛ هەموو ئەم ڕووە هەمەجۆر و واتایانە بە بەشێک لە واتاکانی قورئان دەژمێردرێن و دادەنرێن، بە مەرجێک لە ڕووی زانستەکانی زمانی عەرەبییەوە ڕاست بن و لە ڕووی بنەما ئایینییەکانەوە دروست و تەواو و لە لایەنی ڕەوانبێژیشەوە پەسەند بن.

قورئانی پیرۆز بۆ گەیشتن بە هەر یەکێک لەم ڕووانە یان لەم واتایانە، نیشانەیەکی لەفزی یان مەعنەویی داناوە کە ئاماژەیان بۆ دەکات.

نیشانە مەعنەوییەکەش یان لە میانە و شێوازی قسەکەوە لە هەمان ئایەتدا وەردەگیرێت، یان لە ئایەتێکی ترەوە وەردەگیرێت کە ئاماژە بۆ واتاکە دەکات.

---

[1] بڕوانە بۆ کتێبی (وتەکان)، ل٥٧٩.

کتێبەکانی تەفسیریش کە ژمارەیان بە هەزارانە و زانایانی لێکۆڵەر و لێهاتوو دایانناون، هەر هەموویان شایەتی بۆ گشتگیری و لەئاسابەدەریی قورئان دەدەن (سوزلر[1]: وتەکان، ٤١٤-٤١٥).

پاشان مامۆستا دەڵێت:

"ئەگەر بڵێیت: لە تایبەتمەندییەکانی ڕێنمایی و ڕەوانبێژی ئەوەیە کە ڕوون و ئاشکرا بن و بیر و مێشک لە پەرتوبڵاوی بپارێزن.

ئەی بۆچی موفەسیرەکان لە تەفسیری ئەم جۆرە ئایەتانەدا جیاوازییەکی وەهایان لێ دەرکەوتووە کە بیروهۆش پەرشوبڵاو دەکاتەوە و چەندین لێکدانەوەی جیاواز و ڕووی پێچەوانەیان خستووەتە ڕوو، ئیتر چۆن لەناو ئەم ڕا و بۆچوونە جیاوازانەدا هەق بزانرێت و بناسرێتەوە؟ ئەوا لە وەڵامدا پێت دەوترێت:

لەوانەیە هەموویان هەق بن، ئەویش بە ڕەچاوکردنی ئەوەی، کە ئەو بابەتە لە بیسەرێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازە، چونکە قورئان تەنیا بۆ خەڵکی یەک سەردەم دانەبەزیوە، بەڵکو بۆ خەڵکانی هەموو سەردەم و چاخەکان هاتووە، هەروەها بەتەنیا بۆ یەک توێژ نییە و بۆ هەموو توێژەکانی مرۆڤایەتی نێردراوە، تایبەتیش نییە بە یەک چەشن یان پۆلی ئادەمیزادەوە، بەڵکو بۆ هەموو چەشن و پۆلەکانە، هەموو یەکێکیش بەش و پشکی خۆی هەیە لە تێگەیشتنی لێی.

دەبێت ئەوەش بزانین، کە تێگەیشتنی مرۆڤەکان؛ پلە پلەیە و ڕووی چێژوەرگرتنیان جیاجیایە، حەز و ئارەزووەکانیان بەملا و ئەولادا پەرتەوازەیە، پەسەندکردنیان بۆ شتەکان وەک یەک نییە و هیی هەریەکەیان لە ڕوویەکەوەیە؛ هەستکردنیان بە خۆشی جۆراوجۆرە، هەمووشیان یەک سروشتیان نییە، بەڵکو بەش بەشن، هەر لەبەر ئەمەشە، کە دەبینین چەندین شت هەن بەلای کۆمەڵێکەوە بە باش دەزانرێن، بەڵام لای کۆمەڵێکی تر بەو جۆرە نییە، چینێک چێژی لێ

---

[1] سوزلر، چاپی ئەستەنبوڵ

وەردەگرن، بەڵام چینێکی تر ناگەنە ئەو ئاستە، ئیتر بەگوێرەی ئەمە پێوانەی خۆت بکە و لێکیان بدەرەوە، هەر لەبەر ئەم نهێنی و حیکمەتەیە، کە قورئان زۆر جار شت و لایەنی تایبەتی بواردووە و لای بردوون، تاوەکو بە شێوەیەکی گشتی بمێنێتەوە و هەموو یەکێک خواستی چێژ و بە باش زانینی تایبەت بە خۆی تیا بدۆزرێتەوە و بەدیی بکات.

قورئانی پیرۆز لە پێناو ڕەچاوکردنی تێگەیشتنە جیاوازەکاندا؛ ڕستەکانی بە چەشنێک داڕشتووە و لە شوێنی وەهادا دایناون کە لە هەموو لاکانیەوە ڕووی جۆراوجۆریان لێ دەکرێتەوە، تاوەکو هەر یەکێک لەو تێگەیشتنە جیاوازانە پشکی خۆی لێ وەربگرێت، ئەمەش بکە بە پێوەر بۆ تێگەیشتنە جیاوازەکان.

کەوابوو دەشێت ڕووەکان هەر هەموویان مەبەستی قورئان بن، بەڵام بەو مەرجەی زانستەکانی زمانی عەرەبی ڕەتیان نەکەنەوە و لە ڕووی ڕەوانبێژییشەوە شیاو بن و بەپێی زانستی (مەبەستەکانی شەریعەت)یش پەسەند بن. کەواتە لەم سەرنجەوە بۆمان دەرکەوت: یەکێک لە ڕووەکانی ئیعجازی قورئان بریتییە لەوەی: کە هۆنین و داڕشتنی ڕستەکانی قورئان بە شێوازێکە لەگەڵ تێگەیشتنە جیاوازەکانی هەموو سەردەم و چەرخەکان و گشت چینوتوێژێکدا دەگونجێت و یەک دەگرێتەوە." (إشارات الأعجاز، ٤٠-٤١)، چاپی تازە، ٤٩

پاشان مامۆستا دەڵێت[١]: "ئێستا با نموونەیەک بەم ئایەتە بهێنینەوە کە خوای گەورە دەفەرموویت: **﴿أَوَلَمْ يَرَى الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنْ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلاَ يُؤْمِنُونَ﴾** (الأنبياء: ٣٠) واتە: "ئایا ئەوانەی بێباوەڕبوون؛ نەیانبینیوە و بۆیان ڕوون نەبۆتەوە کە بەڕاستی ئاسمانەکان و زەوی یەک پارچە بوون، پاشان لێکمان جیا کردنەوە؟"

[١] بڕوانە بۆ کتێبی (وتەکان)، ل ٥٧٥-٥٧٦.

ئەگەر کەسێک لە مەسەلە فەلسەفییەکاندا قووڵ نەبووبێتەوە، ئەوا بەم جۆرە لەم ئایەتە تێدەگات؟ لە کاتێکد ئاسمان ڕوون و سایەقە بووە و هیچ پەڵە هەورێکی پێوە نەبووە، زەوییش وشکوبرنگ بووە و بەکەڵکی بەرهەمهێنان نەهاتووە؛ خوای گەورە ئاسمانی بە باران واڵا کردووە و زەوییشی بە سەوزایی کردووەتەوە و بەم چەشنە هەردووکیانی پێکەوە جووت کردووە و لە ئاویش هەموو شتێکی زیندووی فەراهەم هێناوە.

بەڵام هەر هەمان ئایەت واتاکەی ڕوویەکی تری هەیە لەلای کەسێکی تر، کە خاوەنی وردبینی و لێکۆڵینەوەی زیاترە لەو بوارەدا و بەم جۆرە لێی تێدەگات: لە سەرەتای هاتنەبوونی بوونەوەراندا؛ ئاسمانەکان و زەوی یەک تۆپەڵی کەڵەکەبوو بوون و هیچ شێوەیەکیان نەبووە و وەک هەوێرێکی بێسوود وا بوون و هیچ بوونەوەر و دروستکراوێکیان تێدا نەبووە، بەڵام خوای گەورەی بەدیهێنەر و دانا؛ واڵا و بڵاوی کردوونەتەوە و هەردووکیانی وا لێ کردووە کە بەسوود و بەرهەمدار و ڕازاوە بن و کردوونی بە سەرچاوەی زۆرێک لە دروستکراوەکانیش.

بەم چەشنە لێی تێدەگات و دانایی خوای پەروەردگار بە گەورە ڕادەگرێت.

هەر هەمان ئایەت لە ڕوانگەی دانایەکی هاوچەرخەوە، ئەم چەشنە تێگەیشتنەی لێ وەردەگرێت:

زەویی خۆمان و هەموو هەسارە گەڕۆکەکانی تری کۆمەڵەی خۆر، لە سەرەتادا هەموویان لەگەڵ خۆردا ئاوێتە بوون و وەک هەوێرێک بەیەکەوە تێکەڵ بوون، بەڵام دواتر خوای گەورەی ڕاگر و سەرپەرشتیار و بەتوانا ئەم هەوێرەی یەکاڵا و بڵاو کردووەتەوە و هەریەک لە هەسارە گەڕۆکەکانی لە شوێنی خۆیدا داناوە، پاشان خۆڵی لەسەر زەوی دروست کردووە و بارانی لە ئاسمانەوە ناردووەتە خوارەوە و لە خۆرەوە تیشکی ناردووە و دنیای بە ژیان ئاوەدان کردووەتەوە.

ئیتر بەم جۆرە لێی تێدەگات و لە سروشت پەرستی ڕزگاری دەبێت[1].

لەوانەیە مرۆڤ بە خەیاڵیدا بێت و بپرسێت: هەندێ جار ئەو واقیعەی ئێمە دەیبینین، پێچەوانەی ئەو شتانەیە کە قورئان هێمای بۆ کردوون، بۆ نموونە: ئێمە دەبینین خۆر هەڵدێت و ئاوا دەبێت، بەڵام زەوی ڕاخراو و بێجووڵەیە، ئەی لەم بارەیەوە چی دەڵێیت[2]؟

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێین: قورئان پەرتووکی ڕێنمایی و ڕێنیشاندانە، ڕێنیشاندانیش ئەو کاتە سوودی دەبێت ئەگەر لە پلە و ئاستی ئامادەیی تێگەیشتن و بیروبۆچوونی بەشی هەرە زۆری جەماوەردا بێت، ئاشکراشە کە زۆربەی زۆری جەماوەر عەوامن، عەوامیش ناتوانن لە ڕاستییە ڕەهاکان تێبگەن و بیانبینن، بەڵکو ئەگەر ڕاستییەکان لە بەرگێکدا نەبێت کە ئەوان بە خەیاڵ و بۆچوونی خۆیان پێی ئاشنان؛ ئەوا هەرگیز پێی ڕانایەن و هۆگری نابن[3].

هەر لەبەر ئەم خاڵەشە، کە قورئان ئەو ڕاستییانەی لە وێنەی شتی هاوشێوە و نموونەی لەیەکچوو و بابەتی خوازراودا خستووەتە ڕوو، تاوەکو ئەو جەماوەرەی تواناى تێگەیشتنیان لەو ئاستەدا نییە لێیان تێبگەن؛ لەوە بپارێزرێت کە بکەونە گرفت و داوی بەدرۆخستنەوەی ڕاستییەکەوە کە پەیی پێ نابەن و نایزانن. لەبەر ئەوە، قورئان بە شێوەیەکی تێکڕایی و گشتی و دوور لە وردەکاری، باسی لەو مەسەلانە کردووە کە جەماوەر بە هەستێکی ڕووکەشانە بۆیان دەڕوانن و بڕوایان وایە کە پێچەوانەی واقیعن؛ بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هێمای بۆ ڕاستیی مەسەلەکان کردووە، ئەویش لە ڕێی دانانی چەند نیشانەیەکەوە کە ئاماژە بۆ ئەو ڕاستییانە بکەن.

---

[1] بڕوانە: (سوزلر: وتەکان،٤١١-٤١٢، کوردییەکەی: ٥٧٥-٥٧٦)

[2] ئەم پرسیارە هیی نووسەرە (د. سوعاد)، وەڵامەکە هیی (مامۆستا نوورسی )یە. (مامۆستا فارووق).

[3] ئەم پەرەگرافە وەک (د. سوعاد) ئاماژەی بۆ کردووە لە (اشارات الاعجاز)دایە، واتاکەشی لە (مەکتووبات)دا بە کوردی ل(٣٤٢)دا هەیە.

جا ئەگەر ئەم خاڵەت ڕەچاو کرد و لێی تێگەیشتیت، ئەوسا بزانە کە: ئایین و شەریعەتی ئیسلامی کە لەسەر بەڵگەی عەقڵی دامەزراوە؛ بریتییە لە پوختەی چەندین زانست و بواری زانیاری، کە هەموو بڕگە گرنگەکان و باسە پێویستەکانی گشت زانستە بنەڕەتییەکانی لەخۆ گرتووە، لە نموونەی زانستی خاوێنڕاگرتنی ڕۆح، زانستی ڕامکردنی دڵ، زانستی پەروەردەی ویژدان، زانستی خەمخواردن لە لاشە، زانستی بەڕێوەبردنی ماڵ، زانستی ڕامیاریی شارستانی، زانستی مافەکان و مامەڵەکان و هونەری دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان و... چەندین بواری تر.

سەرەڕای ئەمەش، هەمیشە شەریعەت لەو شوێنانەی پێویست بە ڕوونکردنەوە دەکات و جێگەی ئەوەن ئاتاجی شیکردنەوەیان هەبێت؛ ڕاڤە و شیکردنەوەی کردووە و ڕوونکردنەوەی تەواوی خۆی لەسەر داون.

بەڵام سەبارەت بەو شتانەی لە کاتی خۆیدا پێویست نەبوون، یان ئامادەیی بیر و هزرەکان لەو ئاستەدا نەبووە کە لێیان تێبگەن، یان لەگەڵ ئەو کات و سەردەمەدا نەگونجاوە؛ ئەوا شەریعەت تەنیا پوختەیەکی[1] لە بارەوە باس کردوون و بنچینەیەکی بۆ داناون، ئیتر هەوڵی تێگەیشتنی زیاتر و لێوەرگرتنی چەمکی تر

---

[1] ئەگەر بڵێیت: قورئانی پیرۆز و ڕاڤەکەشی -مەبەستم فەرمایشتەکانی پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر)- لە هەر زانستێک پوختەیەکیان وەرگرتووە، جا ئایا لە توانای هیچ کەسێکدا هەیە ئاگاداری ئەو ژمارە زۆرەی لە پوختە جۆراوجۆرەکان بێت و بیانزانێت؟ ئەوا لە وەڵامدا پێت دەوترێت: لە ڕاستیدا ئەگەر فەراهەمهێنانی هەر پوختەیەک بە جۆرێک بێت کە بەباشی لە شوێنی گونجاوی خۆیدا دابنرێت و مەبەست بپێکێت و لە زەمینەیەکی لەبار و بەرهەمداردا بەکار بهێنرێت، هاوکات چەندین هێمای تیا بێت بۆ کۆمەڵە بابەتێک کە پێشتر نەبیسترابن -وەک لە خاڵی دووەمدا ئاماژەمان پێ دا- ئەوا ئەم چەشنە پوختەکارییە -بە وێنەی شووشەیەکی ڕوون کە ناوەوەی جوان دیارە- زۆر بەڕوونی ئەوە دەردەخات کە بەهرەمەندی و شارەزایی تەواو لەو بوارە زانستییانەدا هەیە کە پوختەکەی لێ وەرگیراوە، بەمەش پوختەکە وەک زانستەکە حساب دەکرێت و حوکمی ئەو وەردەگرێت، ئەم چەشنە کارەش -واتە پوختەکاری بەو شێوەیەی باسکرا- لە توانای کەسدا نییە و بە کەس ناکرێت ئەو ژمارە زۆرە پوختەیە فەراهەم بێنێت. دەقی ئەم پەراوێزە هیی مامۆستا نوورسی خۆیەتی لە (اشارات الاعجاز)دا، ل ١٧٦ی ئەو چاپەی (د. سوعاد) پشتی پێ بەستووە، ل١٧٣ی چاپە تازەکان. (م . فاررووق)

و لق لێکردنەوە و پەرەپێدان بە باسی وردەکاریەکانیانی حەواڵەی ڕاوێژ و توانای ژیرییەکان کردووەتەوە. (إشارات الأعجاز، ١٧٥، چاپی تازە:١٧١-١٧٢).

بۆ نموونە: قورئان ڕەچاوی ئەو جۆرە کەسانە دەکات، کە تەنیا بە هەستێکی ڕووکەش لە شتەکان دەڕوانن، بە نەرمی و میهرەبانی لەگەڵیاندا دەدوێت. کاتێک ئەوان تەنیا ڕووکاری زەوی دەبینن و وا دەزانن کە زەوی بێ جووڵەیە و تەختە، قورئان بەڕاشکاوی پێیان ناڵێت: زەوی خڕە و بەخێرایی بەدەوری خۆی و خۆردا دەسووڕێتەوە.

نەخێر، قورئان هەرگیز نەیویستووە سەر لە خەڵکی تێک بدات و بیروبۆچوونیان بشێوێنێت و بەمەش لە ڕێنمایی قورئان دوور بکەونەوە، چونکە ئەگەر قورئان ئەم مەسەلەیە و ڕاستەقینە زانستییەکانی تری هاوشێوەی بە زەقی و ڕاشکاوی باس بکردایە؛ ئەوا خەڵکی دەوریان چۆڵ دەکرد و نکوڵییشیان لەو شتانە دەکرد، ئاشکراشە شتێکی بەم جۆرە نەبووە.

بەڵام سەرەڕای ئەوەی قورئان ڕەچاوی ئەمەی کردووە، لەولاشەوە ئەوەی فەرامۆش نەکردووە ئاماژە بکات بۆ ئەو سەردەم و ئەو ئاستەی، کە خەڵکی تیایدا دەگەن بەوەی پەی بە شێوەی ڕاستەقینەی زەوی یان جووڵەکەی ببەن.

بەگوێرەی ئەم ڕاستییە، پێویستە زانایانی تەفسیر لەم سەردەمانەی دواییدا هەوڵی ئەوە بدەن گونجاندن لەنێوان ڕاستییە دۆزراوەکانی بوونەوەر و ئەو دەقە قورئانییانەدا پێک بێنن کە ئاماژە بۆ ئەم دۆزینەوانە دەکەن، چونکە ئەم ڕاستییانە بە شێوەیەکی کورت و لە شێوەی پوختەباسدا لە قورئاندا هاتوون و ئاماژەیان بۆ کراوە.

بەپێی ئەوەش کە ئەم مەسەلانە لە چەشنی بابەتەکانی بیروباوەڕ و پەرستش و حوکم و مامەڵەکان نین، ئەوا دەشێت ئەوەندە بەس بووبێت بۆ نەوەکانی پێشوو کە بە واتایەکی گشتی و شێوەیەکی کورت لێی تێبگەن و باوەڕی پێ بێنن، ئەمەش هیچ کەموکوڕی یان نەنگییەکی تیا نییە، نە بۆ قورئان و نە بۆ پێشینانی ئەم نەتەوەیە کە توانای ئەوەیان نەبووبێت وردەکاریی ئەم مەسەلانە بزانن و

پەیی پێ بەرن، بەڵکو ئەمە خۆی لە خۆیدا بەڵگەیەکی دیکەی ئیعجازی قورئانە، چونکە ئەوەتا قورئان خۆی بەڕاشکاوی ئەوە ڕادەگەیەنێت کە هەندێ مەسەلەی لە خۆگرتووە لە کاتی هاتنەخوارەوەیدا ڕاستییەکانیان دەرنەکەوتووە و ڕوون نەبووەتەوە.

وەک دەفەرموویت: ﴿بَلْ كَذَّبُوا بِمَا لَمْ يُحِيطُوا بِعِلْمِهِ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُ كَذَلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ فَانْظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الظَّالِمِينَ﴾ (يونس: ٣٩)، واتە: "ئەوانە بڕوایان بە قورئان نەهێنا و بە درۆیان دانا، کە هیچی لە بارەوە نازانن و هێشتا سەرەنجامی باسەکانی قورئانیان بۆ نەهاتووە." دوا ڕستەی ئایەتەکە﴿ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُ﴾ڕاشکاوانە ئاشکرای دەکات کە قورئان هەندێ ڕاستیی لەخۆ گرتووە، بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار دەردەکەون و ڕوون دەبنەوە.

(شهاب‌الدين الآلوسي) لە تەفسیرەکەیدا کە ناوی (روح المعاني)یە، لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: "التأويل" جۆرێکە لە تەفسیر: "الإتيان" بە مانای مەجازی (واتاگۆڕی) لە بریی زانین و وەستان بەکار دێت، ڕەنگە هەڵبژاردنی "الإتيان" لەم شوێنەدا بۆ ئەوە بێت کە وا بگەیەنێت ئەو واتایانە بۆخۆیان بەرەوبیروهۆش دەچن و بەرەو ڕوویان دەڕۆن. دەشێت مەبەستیش لە" التأويل"، بەدیهاتن و ڕوودانی واتاکە بێت کە بریتییە لەو ئاکام و سەرەنجامەی پێی دەگات، کە ئەمەش لای هەندێک بریتییە لە واتای ڕاستەقینەی "التأويل". لەم کاتەشدا هاتنەکە "إتيان" مەجازە و لە بریی ڕوونبوونەوە و دەرکەوتنی واتاکان بەکار هێنراوە و واتای ﴿ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُ﴾ بەم جۆرە دەبێت: "تا ئێستا سەرەنجامی ئەو هەواڵانەی نێو قورئانیان بۆ ڕوون نەبووەتەوە کە سەبارەت بە شتە پەنهانەکان داویەتی، تاوەکو دەربکەوێت ڕاستە یان نا. واتە: "قورئان چ لە ڕووی داڕشتن و چ لە ڕووی هەواڵدان لە بارەی شتە پەنهانەکانەوە هەر موعجیزەیە، بەڵام ئەوان (واتە: بێباوەڕان بە قورئان) پێش ئەوەی لە داڕشتنەکەی ورد ببنەوە و بیر لە ماناکانی بکەنەوە یان چاوەڕێی بەدیهاتنی ئەو شتانە بکەن کە هەواڵی

ئەوەی داوە لە ئا﴿یندەدا ڕوو دەدەن؛ بەر لە هەموو ئەمانە کتوپڕ و دەستبەجێ قورئانیان بەدرۆ خستووەتەوە.[10]

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ **(فصلت: ٥٣)**، واتە: "لە ئایندەدا بەڵگە و نیشانەکانی خۆمانیان لە ئاسۆکانی بوونەوەر و لە خودی خۆیاندا نیشان دەدەین، ئەمەش بۆ ئەوەی چاک بۆیان ڕوون بێتەوە و دڵنیا بن لەوەی کە ئەم قورئانە هەق و ڕاست و ڕەوایە، ئایا ئەوە بەس نییە کە بێگومان پەروەدگارت ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا."

ئەم ئایەتە بەڕاشکاوی ئەوە ڕادەگەیەنێت کە خوای گەورە هەندێ لە "بەڵگە و نیشانەکان"؛ واتە هەندێ لە ڕاستییەکانی قورئان، لە کاتێکی دوای سەردەمی هاتنەخوارەوەی قورئان ئاشکرا دەکات.

جا با پێکەوە ئەوە بخوێنینەوە کە زانای پایەداری تەفسیر (ابن کثیر - ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا نووسیویەتی، شایانی باسە کە ئەو لە ساڵی(٧٧٤ک) کۆچی دوایی کردووە، لەناو موفەسیرەکانیشدا دوورترین کەسە لەو جۆرە تەفسیرەی کە بە (تەفسیری زانستی) ناو دەبرێت.

لە بارەی ئەم ئایەتەوە دەڵێت: "واتە: نیشانە و بەڵگەکانی خۆمانیان بۆ ئاشکرا دەکەین لەسەر ئەوەی کە قورئان هەقە و لەلایەن خوای گەورەوە نێردراوەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەرەکەی (دروودی خوای لەسەر)، ئەمەش بە چەند بەڵگەیەکی دەرەکی لە ئاسۆکاندا لە نموونەی فتوحات و سەرکەوتنی ئیسلام بەسەر هەرێمەکاندا و زاڵبوونی بەسەر ئایینەکانی تردا... لەوانەشە مەبەست لە نیشانەکان، شتانێک بێت لە خودی ئادەمیزاددا وەک ئەو ماددانەی ئادەمیزادی لێ دروست کراوە و ئەو ڕەگەزە تێکەڵانەی لە پێکهاتەیدان و ئەو شێوە و شێوازە سەرسوڕهێنەرانەی لەسەری دروست کراوە، بەو جۆرەی کە بەدرێژی لە

---

[1] روح المعاني ١١/١٢٠.

زانستی  توێکاریدا باس کراوە و بەڵگەیە لەسەر دانایی خوای گەورەی بەدیهێنەر و دروستکەر.[1]

(ابن زید)یش دەڵێت: "آفاق السماوات" واتە: "ئەستێرەکان و خۆر و مانگ کە لە ئاسماندا دەگەڕێن، هەروەها ئەو بەڵگە و نیشانانەش کە لە خودی مرۆڤەکاندایە."[2]

(ابن کثیر) بەڕاشکاوی ڕایدەگەیەنێت کە ئەم ئایەتە ئاماژە بۆ هەندێ لەو ڕاستییانە دەکات، کە زانستەکانی زیندەوەرزانی و توێکاری لێی دەکۆڵنەوە.

(ابن زید)یش کە لە زانایانی پێشینە، "الآيات" بە زانستەکانی گەردوون تەفسیر دەکات، بەڵام (ابن جرير الطبري) پابەند نەبووە بەم جۆرە تەفسیرەوە، چونکە بە بۆچوونی ئەو؛ ئاسمانەکان و خۆر و مانگ لەلای خەڵکانی ئەو کاتەش شتگەلێکی بینراو و زانراو بوون.

پاشان مامۆستا نوورسی بە مەبەستی بەرپەرچدانەوەی هەندێ لەو گومانانەی سەبارەت بەم بابەتە دێنە ئاراوە، ئەم ئایەتە باس دەکات کە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَإِنْ كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ (البقرة: ٢٣).

واتە: "جا ئەگەر ئێوە لە دوودڵیدان و گومانتان لەم (قورئانە پیرۆزە) هەیە کە ناردوومانەتە خوارەوە بۆ بەندەی خۆمان (محەمەد - درووودی خوای لەسەر)، ئەوا ئەگەر بۆتان دەکرێت هەوڵ بدەن سوورەتێکی وەک ئەو بهێنن و بانگی هاوکارەکانتان بکەن جگە لە خوا، ئەگەر ڕاست دەکەن."

مامۆستا دەڵێت: "بزانە! ئەم ئایەتە ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە خەڵکانێک - چونکە بێئاگان لەوەی کە پەروەردگار مەبەستی ڕێنیشاندانی خەڵکە، ناشزانن کە ڕێنیشاندان دەبێت بەگوێرەی ئامادەیی بیروهۆشەکان بێت- کەوتوونەتە گومان و دوودڵییەوە و  سەرچاوەی ئەم گومانانەش سێ شتە:

**(یەکەمیان...[1])**

---

[1] تەفسیری (ابن کثیر)، ١٧٥/٧

[2] تفسير الطبري، ٢٥/٥

**دووەمیان:** ئەوان دەڵێن: کە گوایە قورئان بە شێوەیەکی ڕەها و شاراوە باسی لە ڕاستییەکانی دروستکردن و زانستە جۆراوجۆرەکانی بەدیهێنراوەکان کردووە و ئەمەش پێچەوانەی ڕێبازی فێرکردن و ڕێنیشاندانە.

**سێیەمیان:** ئەوان دەڵێن: گوایە هەندێ لە واتا ڕواڵەتییەکانی قورئانی پیرۆز؛ زیاتر لەو شتانەوە نزیکن کە پێچەوانەی بەڵگە عەقڵییەکانن و واتاکانیان لەگەڵ واقیعدا جیاوازن، ئەمەش پێچەوانەیە لەگەڵ ڕاستێتیی قورئان.

پشت بە خوا لە وەڵامدا دەڵێین: ئەی بەدگومانان! باش بزانن کە ئەو شتانەی ئێوە بە ئەندێشەی خۆتان بە هۆکاری کەموکورتیی قورئانی دادەنێن، لە ڕاستیدا بریتین لە کۆمەڵە بەڵگەیەکی سەلمێنەر لەسەر ڕاستی و تەواویی نهێنییەکانی ئیعجازی قورئان. سەبارەت بە گومانی دووەمیش کە تایبەت بوو بە نادیاری و شاراوەیی باسەکانی قورئان لە بارەی پێکهاتنی بوونەوەرەوە بەگوێرەی ئەوەی کە زانستی نوێ لێکی داوەتەوە، وەڵامەکەی ئەوەیە: باش بزانە کە درەختی جیهان ئارەزووی خۆتەواوکردنی تیایە و هەر لەمەوە لقی ئارەزووی بەرزبوونەوە و پێشکەوتن بەرەو ناخی مرۆڤ پەلی کێشاوە، ئەم ئارەزووەش وەک ناوکە تۆو وەهایە و بە هۆی تاقیکردنەوە و ئەزموونی زۆرەوە نەشونما دەکات و لە ڕێی بەدوایەکداهاتنی ئەنجامی بیرۆکە جۆراوجۆرەکانیشەوە پێک دێت و پەل دەهاوێت و فراوان دەبێت، تا سەرەنجام چەندین زانستی ڕێکوپێک و یەکلەدوایەکی لێ دێتە بەرهەم، بە چەشنێک ئەو زانستانەی کە لە دواوە دێن؛ دانامەزرێن تاوەکو ئەوانەی کە لەپێشترن دروست نەبووبن، ئەوانەش کە لە پێشەوەن؛ نابن بە پێشەکی بۆ ئەوانەی دوای خۆیان تا بەتەواوی بە وێنەی زانستە زانراو و ناسراوەکان بە ئاکام نەگەن.

لەبەر ئەوە و بەپێی ئەم نهێنییەی باسمان کرد، هەر کەس بیەوێت جۆرە زانستێک فێری خەڵک بکات و تێیان بگەیەنێت -کە بەرهەمی چەند ئەزموونێکی

---

[1] لەبەر ئەوەی (یەکەمیان) پەیوەندیی بەم باسەوە نییە، ڕاستەوخۆ نووسەر ڕۆشتووەتە سەر (دووەمیان). (وەرگێڕ)

زۆر بێت-، ئەمیش بەر لە دەرکەوتنی ئاکامەکان بە دە سەدە بانگەشەی خەڵکی بکات بۆ ئەو زانستە؛ ئەوا هەوڵەکەی بێسوودە و تەنیا بیروهۆشی خەڵکی دەشێوێنێت و دەیانخاتە گێژاوی سەفسەتەوە و بە هەڵەیاندا دەبات.

بۆ نموونە: ئەگەر قورئان بیوتایە: خەڵکینە! ئەگەر دەتانەوێت گەورەیی خوای بەدیهێنەرتان بۆ دەربکەوێت، ئەوا تەماشای ئەوە بکەن کە چۆن خۆر وەستاوە و بێ جووڵەیە و زەوی دەبزوێت و دەخولێتەوە، بڕوانن کە چۆن یەک ملیۆن زیندەوەر لە دڵۆپێک ئاودا کۆ بووەتەوە!

ئەو کاتە خەڵکی بە هۆی ئەم پەیامەی قورئانەوە؛ یان تووشی بەدرۆخستنەوەی قورئان دەبوون، یان ئەوەتا دەبووایە پێچەوانەی ئەو بۆچوونانەی هەیانە؛ بڕیار بدەن و خۆیان بەهەڵەدا بەرن و ئینکاری لەگەڵ خودی خۆیاندا بکەن، چونکە بەپێی هەستی ڕووکەشی خۆیان یان ڕاستتر بڵێین: بە هۆی هەڵەی هەستەکانەوە ئەوان تەختیی زەوی و خولانەوەی خۆر -بەدەوری زەویدا- ، وەک ڕاستییەکی بەڵگەنەویست و بەرچاو دەبینن.

کە وا بوو شێواندنی بیروهۆشی خەڵکی -بەتایبەتی بە ئەندازەی ماوەی دە سەدە، تەنیا لە پێناو حەزی هەندێ کەسی ئەم سەردەمەی خۆماندا- کارێکە پێچەوانەی بەرنامە و پەیڕەوی ڕێنیشاندانە و لەگەڵ گیانی ڕەوانبێژیشدا ناگونجێت و ناکۆکە.

ئەی ئەو کەسەی کە بەدگومانیت نەکەیت ئەم نموونەیە و هاوشێوەکانی بکەیت بە پێوەر بۆ ڕوانینەکانی ئایندە سەبارەت بە حاڵەتەکانی ڕۆژی دوایی کە لە قورئاندا باس کراون، چونکە کاتێک هەستە ڕووکەشەکانی مرۆڤ بواریان بۆ نەڕەخساوە پەیوەست بن بە هیچ لایەنێکی ئەو حاڵەتانەی ڕۆژی دواییەوە؛ ئەمە وای کردووە ئەو باسانە لە پلەیەکدا بمێننەوە کە شیاوی ئەوە بن ڕوو بدەن و ئەگەری بەدیهاتنیان هەبێت و دەکرێت باوەڕیان پێ بهێنرێت و دڵنیاییش لە بارەیانەوە دروست بێت. لەبەر ئەوە جێی خۆیەتی ئەم مەسەلانە بە ڕوونی و ڕاشکاوی باسیان لێوە بکرێت، بەڵام ئەو بابەتانەی ئێمە لە بارەیەوە دەدوێین، لە

ئەنجامی هەڵەی هەستەکانەوە لە پلەی (دەکرێت و دەشێت) دەرچووە و بە بۆچوونی ئەو خەڵکانە گەیشتووەتە پلەی بەڵگەنەویست.

لەبەر ئەوە لە ڕوانگەی ڕەوانبێژییەوە وەها شیاوە کە بە شاراوەیی و ڕەهایی باسیان بکرێت، ئەمەش لە پێناو ڕێزگرتن لە هەستی ئەو کۆمەڵە خەڵکە و بە مەبەستی پاراستنی بیروهۆشیان لە سەرلێشێوان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قورئانی پیرۆز بە شێوەی ئاماژە و نیشانە و هێما، باسی ئەم ڕاستییانەی کردووە و دەرگای خستووەتە سەر پشت بۆ بیرەکان و لە ڕێی دانانی چەندین نیشانە و بەڵگەوە بانگهێشتی کردوون بۆ ئەوەی بچنە ناو ئەم بابەتانەوە.

جا ئەی ئەو کەسەی بەدگومانیت! ئەگەر کەسێکی بەویژدان بیت و لەو دەستوورە ورد بیتەوە کە دەفەرموویت: ((کلم الناس علی قدر عقولهم[1])). واتە: "بە ئەندازەی ئەوەی عەقڵیان وەریدەگرێت، خەڵکی بدوێنە." هەروەها ئەگەر بڕوانیت بۆ ئەوەی بیر و مێشکی جەماوەر بە هۆی نائامادەیی سەردەم و دەوروبەرەوە

---

[1] نووسەر بەو جۆرە هێناویەتی، بەڵام ئێمە لە پەرتووکەکانی فەرموودەدا بەم لەفزە بەردەستمان نەکەوت، بەڵکو بە لەفزی تر هاتووە ((أمرنا أن نكلم الناس على قدر عقولهم))، واتە: "ئێمەی پێغەمبەران فەرمانمان پێ کراوە بە ئەندازەی عەقڵی خەڵکی قسەیان لەگەڵدا بکەین"، کە ئیمامی (دەیلەمی) بە سەنەدێکی لاواز لە (ئیبن عەبباس)ەوە و ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر) گێڕاویەتیەوە، هەورەها ئیمامی (ابن حجر) لە موسنەدی (الحسن بن سفيان)دوە هێناویەتی کە ئەویش لە (ابن عباس)وە بە لەفزی "امرت ان اخاطب الناس على قدر عقولهم" هاتووە، واتە: فەرمانم پێ کراوە بە ئەندازەی عەقڵی خەڵکی لەگەڵیان بدوێم، (ابن حجر) وتوویەتی کە سەنەدەکەی زۆر لاوازە.

لە صەحیحی بوخاریشدا لە (كتاب العلم، باب ٤٩) وەک وتەیەکی (علي بن أبي طالب) هێناویەتی کە وتوویەتی: "حدثوا الناس بما يعرفون، أتحبون أن يكذب الله و رسوله" فەرموودەی ژمارە ١٢٧، واتە: "ئەو شتە بە خەڵک بڵێن کە دەیزانن و لێی تێدەگەن، ئایا پێتان خۆشە خوا و پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر) بەدرۆ بخرێنەوە." لە پێشەکیی صەحیحی موسلیمیشدا لە (باب ٣)دا لە (ابن مسعود)ەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: "ما أنت بمحدث قوما حديثا لا تبلغه عقولهم الا كان فتنة لبعضهم"، واتە: هەر کات قسەیەکت بۆ کەسانێک کرد کە لە ئاستی عەقڵیاندا نەبوو، ئەوا دەبێت بە فیتنە بۆ هەندێکیان. ئەمانە بەپوختی لە پێشەوا (العجلوني) وەرگیراوە لە فەرموودەی ٥٩٢. (دەزگا)

تێبینی: نووسەر کاتێک ئەم وتەیەی باس کردووە؛ نەیوتووە "فەرموودەیە"، بەڵکو وتوویەتی "دەستوورە"، واتە وەک پەندێک هێناویەتی. (م. فارووق ڕەسول)

بەرگەی ئەو جۆرە ڕاستییانە ناگرن، ئەو داواکارییەشیان پێ هەرس ناکرێت کە پەیوەستە بە تێگەیشتن لەو بابەتانەی لە ئاکامی بەدواییەکدا هاتنی بیرەکانەوە بەرهەم دێن.

ئەگەر ئەم شتانە لەبەرچاو بگریت، ئەوکات دەزانیت کە ئەو شێوازی شاراوەیی و ڕەهاییەی قورئان هەڵیبژاردووە؛ بریتییە لە بێخەوشترین پلەی ڕەوانبێژی، یەکێکیشە لە نیشانە و بەڵگەکانی ئیعجازی قورئان.

سەبارەت بە وەڵامی گومانی سێیەمیش، کە گوایە هەندێ لە واتای ڕووکەشی ئایەتەکان بەلای ئەوەدا دەچن کە دژی بەڵگە عەقڵییەکان و دۆزراوە زانستییەکان بن، ئەوا بزانە مەبەستی سەرەکی لە قورئاندا ئەوەیە کە ڕێنمایی خەڵکی بکات بۆ چوار بنچینە کە بریتین لە:

١- سەلماندنی تاک و تەنیایی خوای بەدیهێنەر.

٢- سەلماندنی پێغەمبەرێتی.

٣- سەلماندنی زیندووبوونەوە و کۆکردنەوەی خەڵکی لە ڕۆژی دواییدا.

٤- چەسپاندنی دادپەروەری.

ئیتر باسکردنی بوونەوەرەکان لە قورئاندا؛ تەنیا شتێکی پاشکۆیە و درێژەباسێکە بە مەبەستی بەڵگەهێنانەوە بۆ ئەو بنچینانە، چونکە قورئان بۆ ئەوە نەهاتووەتە خوارەوە کە لە جوگرافیا و گەردووناسی بکۆڵێتەوە، بەڵکو کاتێک باسی دروستکراوەکان دەکات؛ تەنیا لەبەر ئەوەیە کە ئەو دروستکراوانەی پەروەردگار و ئەو سیستمە سەرسوڕهێنەرەی بوونەوەر بکات بە بەڵگە بۆ گەیشتن بە بەدیهێنەری ڕاستەقینەی سەرتاپای ئەو سیستمە کە خوای گەورەیە.

لە ڕاستیدا شوێندەستی پەروەردگار و مەبەست لە دروستکردن و ڕێکوپێکیی سیستمەکە، لە هەموو شتێکی بوونەوەردا دەردەکەوێت و بەبەر چاوەوەیە.

جا ئیتر گەر نەشزانین کە چۆن و بە چ شێوازێک بەدی هاتووە؛ ئەوا کێشە نییە و گلەییمان لێ ناکرێت، چونکە ئەم مەسەلەیە پەیوەندیی بە مەبەستە سەرەکییەکەوە نییە. کە وابوو مادەم باسی دروستکراوەکان لە قورئاندا بە

مەبەستی بەڵگەهێنانەوەیەوە و وەهاش پێویستە بابەتی بەڵگەکە بەر لە بانگەشەکە؛ شتێکی زانراو بێت لەلایەن بەرامبەرەوە، هەروەها مادەم چاکتر وایە، کە هەمیشە بەڵگە ڕوون و ئاشکرا بێت، لەبەر ئەوە بنەماکانی ڕێنیشاندان و ڕەوانبێژی وا دەخوازن خستنەڕووی ئەم باسانە بە جۆرێک بێت لەگەڵ بیروبۆچوونە هەستپێکراوەکانی خەڵکدا بگونجێت و لەگەڵ زانیارییە ئەدەبییەکانیاندا بشێت و ڕێ بکات، ئەویش بەوەی هەندێ لە واتا ڕووکەشەکانی دەقەکانی قورئان بەو ئاڕاستەیەدا ببرێت کە لەگەڵ بۆچوونەکانی ئەواندا بلوێت، ئەمەش نەک بە مەبەستی سەلماندنیان، بەڵکو تەنیا وەک درکەیەک یان پاشکۆواتایەکی داڕشتنەکان، هاوکات چەند هێما و نیشانەیەکیش دابنێت کە ئاماژە بکەن بە ڕاستەقینەی شتەکان بۆ کەسانی پسپۆڕ و لێکۆڵەر.

بۆ نموونە: ئەگەر قورئانی پیرۆز لە بواری بەڵگەهێنانەوەدا بیفەرمووایە: خەڵکینە! بۆ ئەوەی بەباشی لەوە تێبگەن و بزانن کە خوای گەورە توانا و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە؛ ئەوا بیر لە ڕاوەستاویی خۆر و جووڵە ڕووکەشەکەی بکەنەوە، هەروەها بیر بکەنەوە لە جووڵەی ڕۆژانە و ساڵانەی زەوی، سەرەڕای ئەوەی لە ڕووکەشدا ڕاوەستاوە و بێ جووڵەیە.

هەروەها لە لایەنە سەیرەکانی هێزی کێشکردنی گشتیی نێوان ئەستێرەکان ورد ببنەوە و تەماشای سەرسوڕهێنەرەکانی کارەبا بکەن، بڕوانن بۆ ئەو تێکەڵبوون و ئاوێتەبوونە بێکۆتاییانەی نێوان حەفتا توخمەکە و سەیری کۆبوونەوەی هەزاران گیاندار لە دڵۆپێک ئاودا بکەن.

ئەگەر قورئان بەم چەشنەی بفەرمووایە؛ ئەوا لەم حاڵەتەدا بەڵگەکە بە چەندین پلە لە باسی بانگەشەکەی شاراوەتر و ئاڵۆزتر و زیاتر پەنهان و تەمومژاوی دەبوو، کە ئەمەش پێچەوانەی ڕێسای بەڵگەهێنانەوەیە.

پاشان بەگوێرەی ئەوەی کە ئەم باسانە لە قورئاندا بە چەشنی دوورنیازی یان (درکە- کناية) هاتوون، لەبەر ئەوە واتاکانیان ناچنە ناو خولگەی ڕاست و ناڕاستییەوە.

بۆ نموونە: ئەگەر سەیری وشەی (قال) بکەیت، ئایا ئەوە بەدی ناکەیت، کە پیتی ئەلفەکەی سووکەڵەییەکی بۆ وشەکە دروست کردووە، ئیتر گرنگ نییە و چوونیەکە ئەگەر بنەڕەتی ئەو ئەلفە پیتی واو یان قاف یان کاف بێت!

سەرەنجامی باسەکە ئەوەیە: کە قورئانی پیرۆز بۆ سەرجەم مرۆڤەکانی هەموو سەردەمەکان دابەزیوە، لەبەر ئەوە ئەو سێ خاڵەی باس کران؛ بەشێکن لە بەڵگە و نیشانەکانی ئیعجازی قورئان. (إشارات الاعجاز)، ل ١٧٨-١٨٢[1].

هەروەها مامۆستا سەعیدی نوورسی بۆچوونی وایە، کە چیرۆک و بەسەرهاتی موعجیزەکانی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت)، چەندین ئاماژەیان تیایە بۆ دۆزراوە زانستییە نوێیەکان، شتێکی زانراویشە کە چیرۆکە قورئانییەکان تەنیا بۆ ئەوە باس نەکراون تا ڕووداوە مێژووییەکانمان فێر بکەن، بەڵکو چەندین ئامانج و مەبەستی تریان لەخۆ گرتووە، لەوانە: ئاماژەکردن و ڕێنیشاندانە بۆ هەندێ کاروباری دنیایی.

مامۆستا دەڵێت[2]: "چیرۆک و بەسەرهاتی موعجیزەکانی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت)، وەک چۆن ڕێنیشاندەرن بۆ سوودوەرگرتن لە تەواوی و کامڵیی پێغەمبەران لە ڕووی ئایینییەوە، لە هەمان کاتدا و بە هەمان شێوە ڕێنیشاندەریشن بۆ کەڵکوەرگرتن لە موعجیزە ماددییەکانیشیان. بەڵێ، ڕاستە خوای گەورە چەندین شتی لەئاسابەدەری وەک موعجیزەیەک لەسەر دەستی ئەوان بەدی هێناوە، بەڵام ئەم چیرۆکانە مەیلی چاولێکردن و لاساییکردنەوەی ئەو کارانە لەناو خەڵکیدا دەوروروژێنن. چونکە بێگومان خوای گەورە ئەم

---

[1] لە جیاتیی ١٧٨، نووسراوە ١٨٠، کە ئەمەیان هەڵەیە، لە چاپی تازەشدا (١٧٤-١٧٧). (م. فارووق)

[2] لێرەدا نووسەر باسی نەکردووە کە ئەم بۆچوونەی مامۆستای لە کوێ وەرگرتووە و تەنیا پوختەی قسەکانی مامۆستا نوورسیی هێناوە نەک دەقەکانی، ئاماژەشی بە سەرچاوەکەی نەداوە. بەڕێز مامۆستا فارووق پێی وا بوو کە ئەم باسە پوختە و کورتەی چەند پەرەگرافێکی وتەی بیستەمن لە کتێبی (وتەکان)، بڕوانە وتەی بیستەم لە کتێبی (وتەکان)، ل (٣٠٢-٣٦٩)، بەتایبەت لە (ل٣٥٥). (وەرگێڕ)

موعجیزانەی بەبێ هۆکار بەدی نەهێناوە، بەڵکو چەندین هۆکاری ماددیی بۆ داناون.

بۆ نموونە: 'با'ی کردووە بە هۆکارێک بۆ هاتوچۆی پێغەمبەر سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت)، بە ئەندازەی دوو مانگەڕێ.

قورئانی پیرۆز دەیەوێت لە میانەی ئەم چیرۆکانەوە بفەرمووێت: ﴿فَاعْتَبِرُوا يَاأُولِي الأَبْصَارِ﴾ (الحشر: ٢)، واتە: 'ئەی خاوەن تێڕوانینەکان، پەند وەربگرن'، چونکە موعجیزەکانی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) لە چەندین ڕووەوە پەند و ئامۆژگارییان تیایە بۆ ئێوە. کە وابوو هەوڵ بدەن لە هەر هەموو ڕووەکانەوە سوودمەند بن، کۆشش بکەن و بەم ڕێگەیەدا بڕۆن، بەشکم لە ڕێی سوننەت و ڕێسا گەردوونییەکانی خوای گەورەوە بتوانن شتانێک بەدەست بهێنن لەو موعجیزانە بچن، کە پەروەردگار وەک شتێکی دەستەوسانکەر و لەئاسابەدەر بەخشیویەتی بە پێغەمبەرەکانی (سەلامی خوایان لێ بێت).

دەتوانین بڵێین: چۆن تەواویە ئایینییەکان لەسەر دەستی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) خەڵاتی گرۆی ئادەمیزاد کراون، بە هەمان شێوەش هەندێ لە تەواوی و کامڵبوونە ماددییە ئایینییەکان و لەئاسابەدەرە دنیاییەکانیش هەر لەسەر دەستی ئەوان بەدیاری بەخشراون بە مرۆڤایەتی. بۆ نموونە: کەشتی، لەسەر دەستی پێغەمبەر نوح (سەلامی خوای لێ بێت) پێشکەش بە مرۆڤایەتی کراوە.'هەروەها مامۆستا نوورسی دەڵێت[١]: 'پاشان من لە ڕوانگەی ئەم ئایەتەوە: ﴿وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُبِينٍ﴾ (الأنعام: ٥٩)، واتە: 'هەر تەڕ و وشکێک هەبێت، هەر هەموویان لە تۆمارێکی ئاشکرادان'. هەروەها بە پشتبەستن بەوەی کە قورئان چۆن بە دەق و واتاکانی تێدەگەیەنێت؛ بە هەمان شێوە بە ئاماژە و هێماکانیشی فێرت دەکات، بەگوێرەی ئەمانە من وەها تێدەگەم **مەبەست** لەو ئاماژانەی، کە مامۆستایەتیی ئیعجازی قورئان لە چیرۆکی پێغەمبەران و

---

[١] ئا لێرەوە ئەو بەشە دەست پێ دەکات کە لە (اشارات الاعجاز) وەرگیراوە. (مامۆستا فارووق).

موعجیزەکانیاندا هێناویەتی؛ هاندان و هەڵنانی مرۆڤەکان بێت بۆ ئەوەی هۆکاری گونجاو بگرنە بەر بۆ گەیشتن بە شتانێک کە هاوشێوەی ئەو موعجیزانە بن.

وەک ئەوەی قورئان لە ڕێی ئەو چیرۆکانەوە پەنجە بخاتە سەر هێڵە سەرەکییەکان و ئەو وێنە هاوشێوانەی لە ئایندەشدا لە ئاکامی دوا هەوڵەکانی مرۆڤ لە پێناوی پێشکەوتندا دێنە ئاراوە، ئایندەیەک کە لەسەر دامەزراوەکانی ڕابردوو بنیات دەنرێت، ئەو ڕابردووەی کە ئاوێنەی دوارۆژە. وەک ئەوەی قورئانی پیرۆز دەستی هاندان و تامەزرۆکردن بهێنێت بە پشتی مرۆڤدا و پێی بڵێت: "هەوڵ بدە و کۆشش بکە بۆ بە دەستهێنانی ئەو هۆکارانەی دەتگەیەننە هاوشێوەی هەندێک لەوئاسابەدەرانە[1]."

ئەی نابینیت یەکەم دەستێک کە خەلاتی کاتژمێر و کەشتیی پێشکەش بە مرۆڤایەتی کردووە، دەستی موعجیزە بووە.

گەر دەتەوێت لەم بارەیەوە زیاترت بۆ دەربکەوێت، ئەوا بڕوانە ئەم ئایەتانە:
﴿وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا﴾ (البقرة: ٣١)، واتە: "خوا هەموو ناوەکانی فێری ئادەم کرد."

﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا دَاوُودَ مِنَّا فَضْلاً يَاجِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُ وَالطَّيْرَ وَأَلَنَّا لَهُ الْحَدِيدَ﴾ (سبأ: ١٠)، واتە: "بەڕاستی ئێمە ڕێز و بایەخێکی زۆرمان بە داود بەخشی، (فەرمانمان داوە): ئەی کێوەکان و باڵندەکان، لەگەڵ داود زیکر و تەسبیحات بڵێنەوە، ئاسنیشمان بۆ نەرم کرد."

﴿وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ وَأَسَلْنَا لَهُ عَيْنَ الْقِطْرِ وَمِنْ الْجِنِّ مَنْ يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِ وَمَنْ يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ السَّعِيرِ﴾ (سبأ: ١٢)، واتە: "بۆ سولەیمانیش "با"مان خستە ژێر فەرمانیەوە،

[1] الخوارق.

بەیانیان یەک مانگەڕێ دەڕۆیشت و ئێواران یەک مانگەڕێ دەهاتەوە، کانی - مس-یشمان بۆ تواندەوە.

﴿وَإِذْ اسْتَسْقَى مُوسَى لِقَوْمِهِ فَقُلْنَا اضْرِبْ بِعَصَاكَ الْحَجَرَ فَانفَجَرَتْ مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَشْرَبَهُمْ كُلُوا وَاشْرَبُوا مِنْ رِزْقِ اللَّهِ وَلاَ تَعْثَوْا فِي الأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ (البقرة: ٦٠) واتە: "ئێمەش پێمان وت (واتە بە مووسا پێغەمبەر - سەلامی خوای لێ بێت) گۆچانەکەت بدە بەو تاشەبەردەدا، (کە لێی دا) دوانزە کانیی لێ هەڵقولا."

﴿وَأُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ وَأُحْيِ الْمَوْتَى بِإِذْنِ اللَّهِ وَأُنَبِّئُكُمْ بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ (ال عمران: ٤٩) واتە: "کوێریی زکماک و کەسی بەڵەک چاک دەکەمەوە، مردووانیش زیندوو دەکەمەوە بە فەرمانی خوا."

پاشان سەرنج بدە لە و زانستە زۆروزەبەندانەی لە ئاکامی بەدواییەکداهاتنی بیرۆکەکانی مرۆڤەوە بەدی هاتوون و داهێنراون، کە بە هەزاران دەبن و هەر یەکێکیان زمانحاڵی ناو و تایبەتمەندیی جۆرێک لە بوونەوەرە جۆراوجۆرەکانن و لەوانەوە وەرگیراون. بەمەش مرۆڤ واتا و دیمەنەکانی ﴿وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا﴾ ی ئاشکرا کردووە. پاشان ورد بەرەوە لەو داهێنراوە سەیرانەی، کە هۆش و بیری مرۆڤ دایهێناون لە نموونەی هێڵی شەمەندەفەر و ئامێری برووسکەکردن و چەندین شتی تر کە بە هۆی نەرمکردنی ئاسن و تواندنەوەی مسەوە بەرهەمی هێناون و بەمەش ﴿وَأَلَنَّا لَهُ الْحَدِيدَ﴾ی دەرخستووە، کە ئاسن سەرچاوەی هەموو پیشەسازییەکانە.

هەروەها لەو فڕۆکانە ورد بەرەوە، کە بیروهۆشی مرۆڤ هێناویەتیە بەرهەم کە لە ڕۆژێکدا ماوەی مانگەڕێیەک دەبڕن، بەمەش مرۆڤ لەوە نزیک بووەتەوە کە واتای ﴿غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ﴾ دەربخات و بەرجەستەی بکات.

هەروەها لەو ئاستە ڕامێنە کە هەوڵی مرۆڤ پێی گەیشتووە، وەک داهێنانی چەندین ئامێر و دەزگا و ئامرازی وەها کە کاتێک دەخرێنەگەڕ لە خاکێکی لماویی وشکدا؛ سەرچاوە و ئاوی سازگاری بە تاف لێ هەڵدەقوڵێت و ئەو خاکە لمینە دەگۆڕێت بۆ باخچەیەکی ڕازاوە، بە جۆرێک کە لەوە نزیک بووەتەوە ئایەتی ﴿فَقُلْنَا اضْرِبْ بِعَصَاكَ الْحَجَرَ﴾ ئاشکرا بکات.

هەروەها سەرنج بدە لە ئەزموونەکانی مرۆڤایەتی لە بواری پزیشکیدا کە چەندین شتی لە ئاسابەدەری بەرهەم هێناوە، بە چەشنێک نزیک بووەتەوە لەوەی بە پشتیوانیی خوا؛ کوێریی زکماک و مرۆڤی بەڵەک و خاوەن دەردی درێژخایەن چاک بکاتەوە.

لەمانەوە دەبینیت، کە تەواو گونجاوە و ئاڕاستەیەکی ڕاست و دروستیشە ئەگەر بڵێیت: ئەم دیمەنانە بریتین لەو پەند و ئامۆژگاری و خۆچوواندن و یادکردنەوانەی کە چیرۆکەکان ئاماژەیان بۆ کردووە و خەڵکیان بۆ هان داوە.

هەروەها بڕوانە بۆ ئەم ئایەتانە:

﴿قُلْنَا يَانَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلاَمًا عَلَى إِبْرَاهِيمَ﴾ (الانبياء: ٦٩)، واتە: "ئەی ئاگر سارد بەرەوە و بێزیان بە."

﴿لَوْلَا أَن رَّأَى بُرْهَانَ رَبِّهِ﴾ (يوسف: ٢٤)، واتە: "ئەگەر ئەو بەڵگە ڕوونەی پەروەردگاری نەدیایە."

﴿بُرْهَانَ رَبِّهِ﴾ "دیمەنی پێغەمبەر یەعقوب (سەلامی خوای لێ بێت) كە پەنجەی خۆی گەستووە" وەک لە ڕیوایەتێكدا هاتووە[1].

﴿وَلَمَّا فَصَلَتِ الْعِيرُ قَالَ أَبُوهُمْ إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ ﴾ (يوسف: ٩٤)، واتە: "جا كاتێ كاروانەكە (لە میسر) دەرچوو، باوكیان وتی: بەڕاستی من هەست بە بۆنی یوسف دەكەم."

﴿يَاجِبَالُ أَوِّبِي﴾ (سبأ: ١٠)، واتە: "ئەی چیاكان، لەگەڵ داود زیكر و تەسبیحات بڵێنەوە."

﴿وقَالَ يَاأَيُّهَا النَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ الطَّيْرِ﴾ (النمل: ١٦)، واتە: "(سولەیمان) وتی: ئەی خەڵكینە، فێری زمانی باڵندەكان كراوین."

﴿أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَنْ يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ﴾ (النمل: ٤٠)، واتە: "من بۆت دێنم پێش ئەوەی چاوت بترووكێنی."

ئەمانە و چەندین ئایەتی تری هاوشێوەیان.

پاشان سەرنج بدە لەو شتانەی كە مرۆڤ دۆزیونیەتیەوە، وەک ئەو پلە ئاگرەی كە سووتێنەر نییە و ئەو هۆكار و كەرەستانەی ڕێ لە سووتاندن دەگرن. هەروەها سەرنج بدە لەو هۆكارانەی لە بواری گواستنەوەی دەنگ و ڕەنگدا دایهێناون، كە دەتوانن وێنەكان و دەنگەكان لە شوێن و ماوەی دوورەوە لە چاوترووكانێكدا بهێننە بەر دەست و بۆت ئامادە بكەن. پاشان تەماشای ئەو

---

[1] (السيوطي) لە تەفسیرەكەیدا باسی كردووە و وتوویەتی: (عبدالرزاق) و (الفريابي) و (سعيد بن منصور) و (ابن جرير) و (ابن المنذر) و (ابن أبي حاتم) و (أبو الشيخ) و (الحاكم) لە (ابن عباس)وە گێڕاویانەتەوە و (الحاكم) بە ڕیوایەتێكی ڕاستی داناوە. لەم گێڕانەوەیەدا هاتووە كە "حتى رأى برهان ربه"، واتە: جبريل (سەلامی خوای لێ بێت) لەسەر شێوەی پێغەمبەر یەعقوب (سەلامی خوای لێ بێت) هاتووە، بە چەشنێک هەردوو پەنجەی خۆی گەستووە... تا دوایی باسەكەی هێناوە، (الطبري)یش لە تەفسیرەكەیدا گێڕانەوەی زۆری بە چەندین لەفزی جیاواز لە بارەیەوە هێناوە، كە هەموو ڕیوایەتەكانی قسەوباسیان لەسەرە و كەمترین قسەیەک لە بارەیانەوە بوترێت ئەوەیە، كە هەر هەموویان "مضطرب"ن. (دەزگا)؟

ئامێرانە بکە، کە بیری مرۆڤ دایهێناون لە بواری تۆمارکردن و لێدانەوەی قسەکان، هەروەها بەکارهێنانی چەندین جۆری باڵندە و کۆتر لە بوارە جیاجیاکاندا، زۆر شتی تریش دەکرێت ئەمانەی باسکران؛ بکەیت بە پێوەرێک بۆیان، تاوەکو بۆت دەربکەوێت گونجاوییەکی ئەوتۆ لەنێوان ئەم دوو بەشەدا (واتە لەنێوان ئایەتەکان و داهێنانەکانی مرۆڤدا) هەیە، کە شایستەی ئەوەیە لە بارەیەوە بوترێت: "ئایەتەکان چەندین ئاماژە و هێمایان تیایە بۆ ئەو داهێنان و دۆزینەوانە..."[1]

* * *

دەکرێت ئەم خوێندنەوانە لەم چەند بنچینەیەی لای خوارەوەدا پوخت بکرێنەوە:

١. قورئانی پیرۆز گوفتار و قسەی خوای گەورەیە و لە زانستی خواییەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەو زانستەی چواردەوری هەموو شتێکی گرتووە و بە گشت شتێک ئاگادارە، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە، واتای گوفتارەکانی خوای گەورە بە ڕادەیەک فراوانن، تا ئەو پلەیەی کە ناکرێت قسەی مرۆڤی پێ بەراورد بکرێت، چونکە قسەی مرۆڤ پشت بە زانستێکی دیاریکراو و سنووردار دەبەستێت.

٢. خودی قورئان ئەوەی ڕاگەیاندووە، کە هەندێ لە ڕاستییەکانی لە سەردەمانێکی دوای سەردەمی هاتنەخوارەوەیدا ئاشکرا دەبن و دەردەکەون.

٣. قورئانی پیرۆز ڕووی گوتار و پەیامەکەی ناکاتە نەوەیەک و شوێنێکی دیاریکراو، بەڵکو بۆ هەموو مرۆڤایەتییە، لە گشت سەردەم و جێگەیەکدا تا هاتنی ڕۆژی دوایی.

٤. ئایەتە دامەزراو و واتا ڕۆشنەکانی قورئان (محکمات) سەبارەت بە بیروباوەڕ و پەرستن و کار و کردەوە و حوکمەکان؛ هەر لە سەردەمی پێشینانی چاکەکارەوە (السلف الصالح) واتاکانیان زانراون و تێگەیشتنی تێروتەسەلیان لە

---

[1] (اشارات الاعجاز)، ٢٥٣-٢٥٥، لە چاپی نوێدا: ٢٣٨-٢٣٩.

بارەوە گەلاڵە بووە، هەروەها ئەم واتا بنچینەییانەی قورئان، هەرگیز بە وەرچەرخانی ڕۆژگار و تێپەڕبوونی کات ناگۆڕێن و ئاڵوگۆڕیان بەسەردا نایەت.

بەلام جگە لەم مەبەستە سەرەکییانە، قورئان چەندین واتای لاوەکییشی لەخۆ گرتووە کە لەو ئایەتانەی واتای زیادە و جۆراوجۆر هەڵدەگرن (متشابهات)؛ سەرچاوەیان گرتووە.

دەشێت واتاکانی ئەم چەشنەیان، دوای سەردەمی هاتنەخوارەوەی قورئان بە چەندین سەدە، ئەوکات بەتەواوی و بە وردەکارییەوە ڕۆشن ببنەوە و دەرکیان پێ بکرێت، لەوانەشە تێگەیشتنی پێشینی ئەم ئوممەتە بۆ هەندێ لەم ئایەتە فرە واتایانە، بریتی بێت لە تێگەیشتنێکی گشتی، کە لە ڕووکەشی ئایەتەکانەوە وەرگیرابێت.

٥. خوای دانا و کاربەجێی ڕەها، ویستوویەتی قورئانەکەی، هەموو چەشن و جۆرەکانی ئەم موتەشابیهانە یان فرەواتایانە لە خۆیدا کۆ بکاتەوە، کە بە هۆیانەوە قورئانی پیرۆز ژمارەیەکی یەکجار زۆر و بێشومار واتای جۆراوجۆری لەخۆ گرتووە.

"لەم جۆرە بابەتانەدا، خوای گەورە نەیویستووە مەسەلەیەکی دیاریکراو بسەپێنێت بەسەر بەندەکانیدا، بەڵکو دەرگای ئیجتیهادی والا کردووە بۆ ژیریی مرۆڤایەتی، تاوەکو بۆخۆی ئەو ڕێگەیە بگرێتەبەر و ئەو نیعمەتەی خوا پێی داوە لە بواری تێگەیشتن و دەرکپێکردندا؛ بەدیی بهێنێت و تیا ڕەنگ بداتەوە."[١]

"هەندێ کەس وەها گومان دەبەن، کە لەیەکچووەکان (موتەشابیهەکان) بە چەشنێکن هیچ واتایەک نابەخشن و تەواو نادیارن، ئەم گومانەش هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە لە ڕاستیدا ئەم موتەشابیهانە نە فەرامۆشکراون و نە قسەی بێواتاشن، بەڵکو لەبەر ئەوەی ژمارەیەکی زۆر واتایان لەخۆ گرتووە؛ ناتوانین ئەو واتایەی، کە مەبەستە بەڕۆشنی یەکلا بکەینەوە و وەها دەردەکەوێت، کە واتاکانیان نادیار بن. هۆی ئەم نادیاری و شاراوەییەش ئەوەیە، بیری مرۆڤ

---

[١] محمود شلتوت، تفسير القرآن الكريم، القاهرة، ٦٧-٦٨.

نەیتوانیوە لەو ڕاستییە گشتگیرانە حاڵی بێت، کە موتەشابیهە فرەواتاکان مەبەستیانە.

لە ڕاستییشدا فرەواتا: بریتییە لەو دەربڕینەی، کە کۆی لایەن و ڕووەکانی ڕەوانبێژیی لەخۆ گرتووە، هەر لە بەکارهێنانی حەقیقەت و مەجازەوە بگرە تا شێوازی ئاشکرا (ڕاشکاوی) و نموونە هێنانەوە و ساغکردنەوە و دیار و شاراوە، هەر لەبەر ئەوە پێشتر فرەواتامان بە (زانراوێکی نەزانراو) وەسف کرد.

ئاشکراشە، کە شاراوەیی و نادیاریی قسە لە هەندێ جێگەدا، یەکێکە لە نایابترین ڕووەکانی ڕەوانبێژی، هەروەک هەموو کەسێکیش شایستەی هەموو جۆرە گوتار و قسەیەک نییە، هەروەها بە شێوەیەکی گشتی لە وزەی مرۆڤدا نییە، کە بتوانێت تەواوی زانستی گشتگیری خوایی وەک پێویست حاڵی بێت و ڕابگەیەنێت.[٢] بڕوانە تەفسیرە بەنرخەکەی موفەسیری تورکی هاوچەرخ (محمد حەمدي باوزیر) کە بە زمانی تورکی دایناوە بە ناوی (حق دیني قرآن دلي)، چاپی ئەستەنبوڵ، ساڵی ١٩٣٥، بەرگی ١، ل٤٨.

بەم شێوەیە دەتوانین هەندێ لە فرەواتاکانی قورئان بچووێنین بە گڵۆپێکی کریستاڵی ئاوێزەیی، کە لە بنەڕەتدا ڕۆشنایيەکەی ناگۆڕێت، بەڵام بە هۆی ئەوەی شووشە کریستاڵەکان ژمارەیەکی زۆر گۆشەیان هەیە؛ ئیتر بەپێی ئەم گۆشانە ڕەنگەکان و تیشکەکانیش دەگۆڕێن، واتە بەگوێرەی جیاوازیی ڕوانینی خەڵکی دەگۆڕێن و بەم چەشنە تیشکدانەوە و شەوقەکان بەبەردەوامی نوێ دەبنەوە.

٦. واتاکانی قورئانی پیرۆز لە چەندین پلەدا خۆیان دەنوێنن و گەلێ واتای هەمەجۆر هەن کە دەچنە ژێر ڕکێفی واتا ئاشکراکانیەوە. واتا ئاماژەیی و هێماییەکانیش پلەیەکن لە پلەکانی واتاکانی قورئان، هەروەها ئەم واتا ئاماژەییانە بۆخۆیان واتاگەلێکی گشتین و لە هەموو سەردەمێکدا چەندین بەش و تاکیان هەیە، ئەم بەشانەش نەک هەر لە بەها و پایەی قورئانی پیرۆز کەم ناکەنەوە، بەڵکو خزمەت بە بواری ئیعجاز و ڕەوانبێژییەکەی دەکەن و بەهێزی دەکەن[١].

---

[١] (سعید النورسي)، شعاع، ٦٤٤.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، قورئان هێندە نادیار و ئاڵۆز بێت، کە بتوانیت بە ویستی خۆت بۆ هەر لایەک بتەوێت؛ ڕایبکێشیت، بەڵکو مانای وایە: کە هەندێ لە ئایەتەکانی قورئان واتاکانیان بە یەکداچوون و تێکهەڵکێشن (وەک ئەو بازنانەی، کە لەسەر ڕووی ئاوێک دەبینرێن، کاتێک شتێک دەخرێتە ناو ئاوەکەوە)، بەبێ ئەوەی واتا بنەڕەتییەکە بگۆڕێت، چونکە ئایەتەکە هەریەک لە ڕواڵەت و ناخ و ڕەگوڕیشەی زۆری لەخۆگرتووە، شێوازی ئایەتەکەش هەموو ئەم ڕەگەزانە دەگرێتەوە، هەر لەبەر ئەمەشە تێگەیشتنی خەڵکی لە ئایەتەکە بەپێی ڕادە و ئاستی زانستییان جیاوازە.

٧. خوای گەورە لە وەسفی قورئانی پیرۆزدا دەفەرموویت: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِكُلِّ شَيْءٍ﴾ (النحل: ٨٩) واتە: "ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە بۆت، کە ڕوونکەرەوەیە بۆ هەموو شتێک." هەروەها پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر) دەفەرموویت: "لا تنقضي عجائبه و لا يخلق على كثرة الرد"، رواه الترمذي [1] في سننه في كتاب فضائل القرآن، ١٤. واتە: "شتە سەرسوڕهێنەرەکانی قورئان کۆتاییان نایەت و بە دووبارەکردنەوە و زۆر خوێندنەوەش کۆن نابێت."

---

[1] پێشەوا (الترمذي) لە بابەکانی (فضائل القرآن)دا ڕیوایەتی کردووە، بابی ١٤، فەرموودەی ٢٩٠، هەروەها پێشەوا (الدارمي) لە سونەنەکەیدا ڕیوایەتی کردووە، بەرگی ٢، ل٤٣٥، هەردووکیان لە (الحارث)ەوە و ئەویش لە (علي)ەوە گێڕاویەتیەوە، سەنەدی فەرموودەکە (أبو المختار الطائي) و (ابن أخي الحارث الأعور)ی تێدایە، کە هەردووکیان نەناسراون. (الحارث الأعور)یش قسەیەکی مەشهوری لەسەرە، هیچ کەسێکی تریش کە قسەی لەسەر نەبێت؛ بە موتابەعە فەرموودەکەی دووپات نەکردووەتەوە، ئیمامی شەوکانیش لە (الفوائد المجموعة)دا لە زاری پێشەوا (الصنعاني)وە دەڵێت: کە هەڵبەستراوە. پێشەوا (المعلمي) لە پەراوێزەکەیدا وتوویەتی: سەنەدەکەی لاوازە، بەڵام دەقەکەی (متن) باشە، لەبەر ئەوە ناشێت بڕیاری هەڵبەستراوی بۆ بدرێت، بڕوانە ل٢٩٦، پێشەوا ئەلبانییش وتوویەتی لاوازە، بڕوانە (ضعيف الجامع).

تێبینی: فەرموودەکە لەلای (الترمذي) بەم جۆرەیە: ((و لا يخلق على كثرة الرد و لا تنقضي عجائبه))، واتە: پێچەوانەی ئەوەی دانەر نووسیویەتی و ڕستەکان پاش و پێش کراون. (دەزگا)؟

جا ئەگەر، ڕاوبۆچوونی پێشەوا (الشاطبي) و دکتۆر (الذهبي) و هاوشێوەکانیان ڕاست و دروست بووایە و جۆری واتاکانی قورئان سنووردار بووایە، ئەوا دەبوو شتە سەرسوڕهێنەرەکانی کۆتاییان بهاتایە و تەواو ببوونایە.

قسە و ڕیوایەتی زۆریش هەن لە بارەی ئەوەی، کە قورئان فرەواتا و ڕووی زۆری هەیە، پەرتووکەکانی تەفسیریش، کە بە هەزاران بەرگ دەبن؛ بە هەموو جیاوازی و هاوڕاییەکانیانەوە گشتیان شایەتی بۆ ئەم فرەواتاییەی قورئان دەدەن.

مامۆستا (محەمەد ڕەشید ڕەزا)ش، کاتێک هاتووەتە سەر شیکردنەوەی ئیعجازی قورئان، لەژێر ناونیشانی (ئیعجازی قورئان بە ساغکردنەوەی هەندێ مەسەلە لای مرۆڤ نەزانراو بوون)؛ باسێکی نووسیوە، کە تیایدا دەڵێت:

"ڕووی حەوتەم: قورئان ساغکردنەوەی زۆر بابەت و مەسەلەی زانستی و مێژوویی لەخۆ گرتووە، کە لە سەردەمی هاتنەخوارەوەیدا نەزانراون و پاشان لە سەردەمەکانی دواتردا درکیان پێکراوە، ئەویش لە ڕێی ئەو زانیارییانەوە، کە بۆ توێژەران و لێکۆڵەران دەرکەوتوون و ئاشکرا بوون، سەبارەت بە سروشتی گەردوون و مێژووی مرۆڤ و ڕێساکانی پەروەردگار لە دروستکراوەکاندا. دوای ئەوەی، کە چەند نموونەیەکی جۆراوجۆر بۆ ئەم بابەتە دەهێنێتەوە، لە کۆتاییدا دەڵێت: کە وا بوو پەرتووکەکەی خوای گەورە ڕوونکەرەوەی ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە خۆیەتی کە دەفەرموێت: ﴿يَسْأَلُهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ﴾ **(الرحمن: ٢٩)** ، واتە: "هەموو ڕۆژێ خوای گەورە لە هەڵسووڕانی کارێکدایە." (تفسير المنار،١/٢١٠-٢١٢)

٨- سەرەڕای ئەوەی، کە بەرزترین مەبەست و بالاترین ئامانج لە ناردنی قورئانی پیرۆز؛ بریتییە لە ڕێنماییکردن و ڕێنیشاندان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قورئان؛ (بنچینەکانی ئیعجاز)ی لە بوارەکانی یاسادانان و دەروونی و ڕەوانبێژی و زانستیدا لەخۆ گرتووە. بڕوانە (تفسير الآيات الكونية)، الدكتور عبدالله شحاته، چاپی القاهرة، ١٤٠٠ک-١٩٨٠ز، ل٢٢.

٩. گومان لەوەدا نییە، کە ناگونجێت ئەو فەرمایشتانەی لەلایەن خوای گەورەی زانا بە پەنهانەکانەوە هاتووە، بەپێی تێگەیشتنی تەنیا کۆمەڵێک، یان بۆچوونی یەک دەستە واتا بکرێن و لێک بدرێنەوە، بەڵکو واتاکان -خۆیان بە چەشنێکن- لەگەڵ ڕاستییەکاندا یەک دەگرنەوە. لەبەر ئەوە ئەگەر هەر شتێک لە زانستێک لە زانستەکاندا لە چوارچێوەی ڕاستیدا گیرسایەوە، ئایاتەکەی قورئانیش پەیوەندیی بەو باسەوە هەبوو؛ ئەوا دەشێت ئەو ڕاستییە زانستییە بە بەشێک لە مەبەستی ئایەتەکە دابنرێت، بە ئەندازەی ئەو ئاستەی تێگەیشتنە جۆراوجۆرەکانی مرۆڤ پێیگەیشتووە یان پێی دەگات، ئەمەش لە پلەیەکەوە بۆ پلەیەکی تر جیاوازە و لە ئاستێکەوە بۆ ئاستێکی تر دەگۆڕێت و لەسەر بوونی تێگەیشتنێکی دروست بنیات دەنرێت.

مەرجەکانی ڕاست و دروستیی تێگەیشتن و لێکدانەوەش ئەوەیە کە:

**یەکەم**: لە چوارچێوەی واتا ڕەسەن و دروستەکانی زمانی عەرەبی دەرنەچێت و وشەکە بۆ ئەو جۆرە واتایە دەست بدات.

**دووەم**: بەبێ بەڵگە لە واتا دیار و ئاشکراکەی دوور نەخرێتەوە بۆ واتایەکی نادیار و شاراوە.

**سێیەم**: بەزۆر سەپاندن و زیادەڕۆیی پێوە دیار نەبێت.

**چوارەم**: لە واتا بنچینەییەکەش بەدەر نەبێت.

ئەمەش بۆ ئەوەی لێکدانەوەکە، وەک تەفسیری (باطني)یەکانی لێ نەیەت، هەروەک مامۆستا (محمد الطاهر بن عاشور) دەفەرمووێت.

١٠. ئاشکرایە مەبەستەکانی قورئان دەگەڕێنەوە بۆ گشتگیریی بانگەوازەکە[١]، خودی قورئانیش موعجیزەیەکی بەردەوام و هەمیشەییە، لەبەر ئەوە وا پێویست دەکات، بابەت و باسی وەهای تێدا بێت بشێت بۆ ئەوەی ئەو خەڵکانەی لە ئایندەدا دێن؛ بەگوێرەی تێگەیشتنی خۆیان بەهرەی لێ وەربگرن لە سەردەمانێکدا، کە زانستە جۆراوجۆرەکان لەناو خەڵکیدا بڵاو دەبنەوە.

---

[١] هەمووان دەگرێتەوە لە گشت جێگە و کاتێکدا. (وەرگێڕ)

١١. سەبارەت بە قسەنەکردنی پێشین لەم بارەیەوە[1]، ئەگەر مەبەست ئەوە بێت ئەوان قسەیان لەو بابەتانە نەکردووە، کە پەیوەندییان بە مەبەستەکانی قورئانەوە نییە؛ ئەوا ئێمەش هاوڕاین و پشتگیریی ئەم بۆچوونە دەکەین، بەڵام ئەگەر مەبەست ئەوە بێت ئەوان قسەیان لەو بابەتانە نەکردبێت، کە پەیوندییان بە مەبەستەکانی قورئانەوە هەیە؛ ئەوا ئێمە دان بەمەدا نانێین و لەگەڵ ئەم ڕایەدا نین و پێمان وا نییە ئەوان (واتە پێشین) تەنیا لە سنووری واتای دیار و ڕووکەشی ئایەتەکاندا وەستابن، بەڵکو لە بواری چەندین زانستدا، کە جێی بایەخیان بوون؛ چەندین شتیان ڕوون کردووەتەوە و باسیان لە وردەکارییەکان کردووە و لق و بەشی تریان بۆ داناوە، ئەمەش ڕێمان لێ ناگرێت، کە ئێمەش شوێنپێی ئەوان هەڵبگرین لە بواری کۆمەڵە زانستێکی تردا، کە بە هەمان شێوە خزمەت بە مەبەستە قورئانییەکان دەکەن، هەروەک زانای موفەسیر (الطاهر بن عاشور) بەڕەحمەت بێت باسی کردووە.

**<u>ڕێبازی مامناوەند ئەوەیە کە دەڵێت:</u>**

قورئانی پیرۆز سەبارەت بە هەموو ئەو شتانەی گرنگە بۆ مرۆڤ بیانزانێت، بۆ ئەوەی بە جەستە و بە گیان بگاتە پلەی تەواوی و کامڵبوون؛ چەند بنچینەیەکی گشتیی لە بارەیانەوە هێناوە، هاوکات دەرگاکەشی بەکراوەیی جێهێشتووە بۆ کەسانی پسپۆڕ و تایبەتمەند، کە خەریکی تاووتوێکردنی زانستە جۆراوجۆرەکانن، تاوەکو -بە ئەندازەی ئەوەی بۆیان ڕەخساوە، بیزانن لەو سەردەمەی خۆیانی تێدا دەژین- وردەکارییەکانی ئەو بوارانە بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوە.

ژمارەیەک لە زانایانی سەردەمی نوێ ئەم ڕێبازە مامناوەندەیان گرتووەتە بەر، لە وێنەی (الطاهر بن عاشور) و (سعيد النورسي) و (محمد رشيد رضا).

---

[1] واتە لێکدانەوەی قورئان بەگوێرەی زانستە جۆراوجۆرەکان. (وەرگێڕ)

بۆ نموونە، خوای گەورە دەفەرمووێت ﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ (الاعراف: ٥٤) واتە: "(خوای گەورە) ئاسمانەکان و زەویی لە شەش ڕۆژدا دروست کردووە."[1]

هەروەها ئایەتی: ﴿وَإِنْ كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ﴾ (البقرة: ٢٣)، واتە: "ئەگەر ئێوە لە گوماندان لەم قورئانەی کە ناردوومانەتە خوارەوە بۆ بەندەی خۆمان (محەمەد – دروودی خوای لەسەر)، ئەوا سوورەتێک بێنن بە وێنەی ئەو".[2]

هەروەها لەو زانایانەی ئەم ڕێبازەیان هەڵبژاردووە؛ مامۆستا (المراغي)یە، بۆ نموونە لە تەفسیرەکەیدا بڕوانە بۆ تەفسیری ئەم ئایەتانە: ﴿وَأَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ شَيْءٍ مَوْزُونٍ﴾ (الحجر: ١٩)، واتە: "ڕواندوومانە تیایدا (لە زەویدا) لە هەموو ڕووەک و بەروبوومێک بەڕێکوپێکی و بە ئەندازەی پێویست." [3]

﴿وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾ (يس: ٤٠)، واتە: "هەریەکەیان (خۆر و مانگ) لە خولگەیەکی تایبەتی خۆیاندا دەسووڕێنەوە." [4]

﴿يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾ (الزمر: ٥)، واتە: "بە شێوەیەکی کەوانەیی شەو دێنێت بەسەر ڕۆژدا و بە هەمان شێوەی کەوانەیی ڕۆژیش بەسەر شەودا دەهێنێت." [5]

---

[1] بڕوانە بۆ (تفسير المنار): ٨/٤٤٥-٤٤٨.

[2] بڕوانە بۆ (تفسير المنار)، ١/٢١٠-٢١٢.

[3] بڕوانە (تفسير المراغي)، ١٥/١٤.

[4] بڕوانە: (تفسير المراغي)،٢٣/١٠-١١.

[5] (تفسير المراغي)، ٢٣/١٤٥.

هەروەها بۆ قسەکانی (الدکتور محمد عبدالله دراز) بڕوانە دەربارەی هەندێ ئایەتی قورئان، کە ئەمیش یەکێکە لەو زانایانە.

﴿فَلْيَنظُرْ الإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ(٥)خُلِقَ مِنْ مَاءٍ دَافِقٍ(٦)﴾ (الطارق: ٥-٦)

واتە: "کەواتە با ئادەمیزاد تەماشا بکات و سەرنج بدات کە لە چی دروست کراوە! لە ئاوێکی هەڵقوڵاو دروست کراوە."

ئەم ئایەتە باس لە سەرچاوە و بنەڕەتی دروستبوونی مرۆڤ دەکات.

﴿فَإِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ﴾ (الحج: ٥)، واتە: "سەرەتا ئێوەمان لە خاک و خۆڵ دروست کردووە و لەوەودوا (نەوەکان) لە نوتفەیەک و پاشان نوتفەش دەبێتە عەلەقە."

﴿ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا﴾ (المؤمنون: ١٤)، واتە: "دواتر نوتفەکەمان کرد بە عەلەقەیەک، پاشان عەلەقەکەمان کردووە بە گۆشتپارەیەک، ئینجا گۆشتپارەکەمان گۆڕیوە بە ئێسک و ئێسکەکەشمان بە گۆشت داپۆشیوە."

ئەم دوو ئایەتە باس لە سیفەتەکانی کۆرپەلە دەکەن لە سکی دایکیدا.

﴿وَجَعَلْنَا مِنْ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾ (الانبياء: ٣٠)، واتە: "هەموو شتێکی زیندوومان لە ئاو فەراهەم هێناوە."

ئەم ئایەتەش باس لەوە دەکات کە سەرچاوە و بنەڕەتی هەموو گیانداران لە ئاوەوە هاتووە.

﴿اللَّهُ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُ فِي السَّمَاءِ كَيْفَ يَشَاءُ وَيَجْعَلُهُ كِسَفًا فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ﴾ (الروم: ٤٨) واتە: "خوا ئەو بایانە

دەنێرێت بۆ ئەوەی هەورەکان بجووڵێنن، ئنجا (خوا) چۆن بیەوێ (ئەو هەورە) بڵاو دەکاتەوە بە ئاسماندا و کۆیان دەکاتەوە لەسەر یەکتر، ئنجا دەبینی باران لەنێوانی هەورەکەوە دێتە دەرەوە و دەبارێت". ئەم ئایەتەش باس لە پێکهاتنی باران دەکات.

﴿يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾ (الزمر: ٥)، واتە: "بە شێوەیەکی کەوانەیی شەو دێنێت بەسەر ڕۆژدا و بە هەمان شێوەی کەوانەیی ڕۆژیش بەسەر شەودا دەهێنێت."

باس لەوە دەکات کە زەوی شێوەکەی گۆییە.

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَأْتِي الأَرْضَ نَنْقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا﴾ (الرعد: ٤١) واتە: "ئایا خوانەناسان نەیانبینیوە ئێمە چۆن ئەملا و ئەولای زەوی کەم دەکەینەوە."

﴿أَفَلاَ يَرَوْنَ أَنَّا نَأْتِي الأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا﴾ (النبياء: ٤٤)، هەمان واتای ئایەتەکەی پێشووترە.

هەردووکیان باس لەوە دەکەن کە شێوە گۆییەکەی زەوی لە لاکانیەوە ناتەواوە.

﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا﴾ (یس: ٣٨) واتە: "خۆریش بەرەو بنکە یان سرەوتی خۆی دەگەڕێت و دەڕوات." پێمان دەڵێت کە خۆر بەرەو خاڵێکی دیاریکراو دەڕوات.

﴿وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلاَّ أُمَمٌ أَمْثَالُكُمْ﴾ (الانعام: ٣٨) واتە: "هەر زیندەوەر و گیانلەبەرێک هەیە بەسەر زەویدا دەڕوات و هەر باڵندەیەک بە باڵەکانی بفڕێت، ئەوانیش هەریەکەیان ئوممەتێکن وەک ئێوە." لەوە دەدوێت کە هەموو پۆلەکانی گیانداران ژیانێکی بەکۆمەڵ دەبەنە سەر بە وێنەی مرۆڤ، بەتایبەتی هەنگ (بڕوانە النحل، ٦٩).

﴿سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الأَزْوَاجَ﴾ (يس: ٣٦) واتە: "پاک و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی کە هەموو دروستکراوەکانی بە جووت دروست کردووە."

﴿وَمِنْ كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ﴾ (الذاريات: ٤٩) واتە: "ئێمە لە هەموو شتێک جووتمان دروست کردووە (لە ئادەمیزاد و گیاندار و ڕووەک و بێگیان و...)" هەردووکیان پێمان دەڵێن، کە خوای گەورە هەموو شتێکی بە جووت دروست کردووە.

﴿وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ فَأَنْزَلْنَا مِنْ السَّمَاءِ مَاءً﴾ (الحجر: ٢٢)

واتە: "ئێمە شنەبامان ناردووە، کە پیتێنەری ڕووەک و دار و درەختە، هەروەها بارانمان لە ئاسمانەوە باراندووە (باس لە پیتاندن دەکات بە هۆی باوە)".

ئەمانە و چەندین نموونەی تری هاوشێوە لە بوارەکەدا.

پاشان دوای ئەوەی دکتۆر (دراز) ڕەخنە دەگرێت لە ڕۆچوون و زیادەڕەوی لە بواری گونجاندنی نێوان دەقە قورئانییەکان و ئەنجامە زانستییەکاندا؛ ئەوکات هاتووەتە سەر باسکردنی سوودی بیرکردنەوە لە ئاسۆکانی بوونەوەر و خودی مرۆڤەکان، دواتریش دەڵێت: "ئێمە هەرگیز تەفسیری ئەو ئایەتانەی باسکران؛ بەو شتە دۆزراوانە ناکەین، کە ئاماژەمان بۆ کردن، بەڵام لە ڕاستیدا خۆمان ئەو گونجان و وەک یەک بوونە سەرسوڕهێنەرە دەبینین، کە لەنێوان دەقە قورئانییەکان و ئەو دۆزراوە زانستییانەدا هەیە، کە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە دواییەکەکانی کەسانی پسپۆڕەوە بە درێژایی چەند سەدەیەکی زۆر هاتوونەتە بەرهەم.

ناشکرێت ئەمە بە ڕێکەوت بێت، بەڵکو وا پێویست دەکات، کە موعجیزەیەک بێت."[١٠]

هەروەها مامۆستا (محمد المدني) و شێخ (محمود شلتوت) و مامۆستا (حسن البنا[١]) و مامۆستا (سید قطب)یش هەمان ڕێبازیان گرتووەتە بەر.

---

[١] بڕوانە (المدخل في القرآن الكريم)، ل١٤٤.

ماموستای شەهید (سید قطب) کاتێک هاتووەتە سەر تەفسیری ئایەتی: ﴿يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾ (الزمر: ٥) وتوویەتی: "لە ڕاستیدا ئەمە دەربڕینێکی سەرسوڕهێنەرە، وا لەو کەسە دەکات کە لێی دەڕوانێت؛ بە تەواوی ناچار بێت ئاوڕێک لەو دۆزینەوە نوێیە بداتەوە، کە دەڵێت شێوەی زەوی گۆییە، ئەگەرچی من لە (في ظلال)دا سوور بووم لەسەر ئەوەی، کە واتاکانی قورئان بەسەر بیردۆزە تازە دۆزراوەکانی مرۆڤدا دانەبڕم، بەڵام سەرەڕای ئەم سووربوون و بەتەنگەوەبوونەشم؛ ئەم دەربڕینە تەواو ناچارم دەکات، کە بڕوانمە بابەتی گۆییبوونی زەوی..."[2]

هەروەها لە تەفسیری ئایەتی: ﴿وَمِنْ كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ﴾ (الذاريات: ٤٩) باسی لەوە کردووە، کە وەک دیاردەیەکی گشتگیر هەموو شتێک لە جووت دروست کراوە و تەنانەت گەردیلەش لەم دیاردەیە بەدەر نییە، کە لە هەردوو بارگەی کارەبایی موجەب و سالب پێک هاتووە.[3]

لە کاتی تەفسیری ئایەتی: ﴿وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِنْ فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ﴾ (فصلت: ١٠) واتە: "لەسەر ڕووکاری زەوی کێوەکانی دامەزراندووە و پیتوبەرەکەتی تێدا دابین کردووە و بژێویی (هەموو گیاندارێکی) تێدا دیاری کردووە، هەمووی لە چوار ڕۆژدا."

ماموستا (سید) قسەی لەسەر پێکهاتنی ئاسمانەکان و زەوی کردووە و بەدرێژی باسی دروستبوونی توێکڵی زەوی کردووە، هەندێ باسیشی لە پەرتووکە زانستییە نوێیەکانەوە وەرگرتووە.[4]

هەروەها بڕوانە بۆ تەفسیری ئەم ئایەتانە لە (في ظلال القرآن)دا:

---

[1] بڕوانە پەرتووکی (تفسير الآيات الكونية)، د. شحاته، ل٩.

[2] في ظلال القرآن، ١٢/٢٤-١٣

[3] بڕوانە (في ظلال القرآن)، ١٢/٢٤-١٣.

[4] بڕوانە (في ظلال القرآن)، ١١٤/٢٤-١١٩.

﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ﴾ **(الاعراف: ١٧٢)** واته: "كاتێ پەروەردگارت پشتاوپشتی نەوەی ئادەمی دەرهێنا و كۆی كردنەوە و (لە جیهانی پەنهاندا) كردنی بە شایەت بەسەر خۆیانەوە."[١]

﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ الصِّيَامُ﴾ **(البقرة: ١٨٣)**، واتە: "ڕۆژووتان لەسەر پێویست كراوە."[٢]

﴿ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً﴾ **(المؤمنون: ١٤)**، واتە: "دواتر نوتفەكەمان كرد بە عەلەقە."[٣]

﴿يَخْرُجُ مِنْ بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ﴾ (الطارق: ٧)، واتە: "لەنێوان بڕبڕەكانی پشت و ئێسكەكانی سینەدا دەردەچێت."[٤]

﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ﴾ **(البقرة: ١٧٣)** واتە: "ئەوەی كە (خوا) قەدەغەی كردوۆوە لێتان، تەنیا مردارەوەبوو و خوێن و گۆشتی بەرازە...". [٥]

هەروەها (العلامة الطباطبائي[٦]) خاوەنی تەفسیری (المیزان)، هەمان ئاڕاستەی هەیە. بڕوانە تەفسیری ئەم ئایەتانە لە تەفسیرەكەیدا:

﴿وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ ﴾ (الحجر: ٢٢)، واتە: "ئێمە شنەبامان ناردووە كە پیتێنەری ڕووەك و دار و درەختە."[١٠]

---

[١] (في ظلال القرآن)، ٩٨/٩

[٢] في ظلال القرآن)، ٧٤/٢

[٣] في ظلال القرآن)، ١٥/١٨-١٦

[٤] (في ظلال القرآن)، ١١٩/٣٠

[٥] (في ظلال القرآن)، ٥٧/٢

[٦] لێرەدا كە نموونە لەم تەفسیرە هێنراوەتەوە لە بواری ئیعجازی زانستییەوە؛ بە هیچ جۆرێك ئەوە ئەوە ناگەیەنێت لە ڕووی بیروڕای مەزهەبییەوە لەگەڵ نووسەردا هاوڕا بین، تەنیا لە ڕووی پاراستنی ئەمانەتی وەرگێڕانەوە وەك خۆی ناومان هێناوە، دەنا تەفسیرەكانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بەسن بۆ هەر بوارێك كە خوێنەری زرنگ بیەوێت و پێویست بە گەڕانەوە ناكات بۆ سەرچاوەی كەسانی دی لە دەرەوەی بازنەی ئەوان. (وەرگێڕ)

﴿وَخَلَقْنَا لَهُمْ مِنْ مِثْلِهِ مَا يَرْكَبُونَ﴾ (يس: ٤٢)، واته: "به وێنەی کەشتی، شتانێکی تریشمان بۆ دروست کردوون، که سواری بن."[٢]

﴿سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنْبِتُ الأَرْضُ﴾ (يس: ٣٦)، واته: "پاک و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی که هەموو دروستکراوەکانی به جووت دروست کردووه لەوەی له زەویدا دەڕوێت."[٣]

﴿أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا﴾ (الأنبياء: ٣٠)، واته: "بەڕاستی ئاسمانەکان و زەوی یەک پارچه بوون، لەوەودوا لێکمان جیا کردنەوە."[٤]

﴿وَجَعَلْنَا فِي الأَرْضِ رَوَاسِيَ﴾ (الانبياء: ٣١)، واته/ "له زەویدا کەژ و کێوەکانمان چەسپاندووە."[٥]

﴿وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ﴾ (يس: ٣٩)، واته: "هەروەها کات و شوێنی هەڵهاتنی مانگیشمان دیاری کردووە."[٦]

﴿وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْيدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴾ (الزاريات: ٤٧)، واته: "ئێمه ئاسمانمان به دەستی خۆمان دروست کردووه و بەردەوام فراوانیشی دەکەین."[٧]

﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍ لَهَا﴾ (يس: ٣٨)، واته: "خۆریش بەرەو بنکه یان سرەوتی خۆی دەگەڕێت و دەڕوات."[٨]

---

[١] (تفسير الميزان)، ١٤٦/١٢
[٢] (تفسير الميزان)، ٩٢/١٧
[٣] (تفسير الميزان)، ٨٧/١٧
[٤] (تفسير الميزان)، ٢٧٧/١٤
[٥] (تفسير الميزان)، ٢٨٨/١١
[٦] (تفسير الميزان)، ٩٠/١٧
[٧] (تفسير الميزان)، ٣٨٢/١٨
[٨] (تفسير الميزان)، ٨٩/١٧

# بابەتی سێهەم

# پوختەی لێکۆڵینەوەی تەفسیری زانستیی قورئان لەنێوان ڕێپێدەران و بەرهەڵستکاراندا

نووسینی: شێخ (محمد الأمين ولد الشيخ)

زانا ناودار و پایەدارەکانمان لەمەڕ بابەتی تەفسیری زانستیی قورئان بوون بە دوو دەستەوە:

دەستەیەکیان ڕێی پێدەدەن و بانگەشەی بۆ دەکەن و وەک سەرکەوتنێکی نوێ تەماشای دەکەن و پێیانوایە نوێکردنەوەیەکە بۆ شێواز و ڕێگەکانی بانگەوازکردن و ڕێنماییکردنی خەڵکی بۆ لای خوای گەورە و ئایینەکەی.

دەستەکەی تریشیان پێیانوایە ئەم جۆرە تەفسیرە وا دەکات، کە قورئان لە چوارچێوەی ئەو ئامانجەی بۆی نێردراوە، بچێتە دەرەوە و بەزۆر بخرێتە بوارێکەوە، کە بەجێهێڵراوە بۆ ژیریی مرۆڤ کاری تیا بکات و تاقیکردنەوەی خۆی تێدا ئەنجام بدات، کە لەوانەیە ڕاستی بپێکێت یان بەهەڵەدا بچێت. لەبەر بوونی ئەم جیاوازییە لە مەسەلەکەدا، وا پێویست دەکات لەم بابەتە بکۆڵینەوە و بەڵگەکانی هەریەک لەم دوو دەستەیە، چ ڕێپێدەران و چ بەرهەڵستکارانیش، بخەینەڕوو و گفتوگۆیان لەسەر بکەین و تاووتوێیان بکەین.

## ڕێپێدەرانی تەفسیری زانستیی قورئانی پیرۆز:

ڕێپێدەران کە زۆرینەن، ئەم زانایانە نوێنەرایەتییان دەکەن:

- پێشەوا (محمد عبده)
- شێخ (محمد رشيد رضا)، کە قوتابیی پێشەوا (محمد عبده)یە.
- شێخ (عبدالحميد بن باديس)
- شێخ (محمد أبو زهرة)
- زانای فەرموودەناسی مەغریب (أبو الفيض أحمد بن صديق الغماري)

هەروەها دەتوانین شێخ (محمد الأمين الشنقيطي)، خاوەنی تەفسیری (أضواء البيان في تفسير القرآن بالقرآن) لە ڕیزی ئەماندا دابنێین.

جا ئەو زانایانەی، کە خاوەنی مەسەلەی تەفسیری زانستیی قورئانن و بەلایانەوە پەسەندە -مەسەلەکەیان هەر وا بەڕەهایی نەهێشتووەتەوە[1]- بەڵکو

---

[1] بۆ زیادە ڕوونکردنەوە و ڕێکخستنی ڕستەکە دانراوە. (وەرگێڕ)

چەند سنووریکیان بۆ ئەم جۆرە تەفسیرە دەستنیشان کردووە، بە چەشنێ دەرگا بە ڕووی کەسانێکدا دابخات، کە هیچ لەم زانستە نازانن و لەگەڵ ئەوەشدا خۆیان بە شارەزای بوارەکە نیشان دەدەن و لافی لێزانی لێ دەدەن. لەو سنوورانەش:

١. پێویستە ئەم جۆرە تەفسیرە پابەندی واتاکانی زمانی عەرەبی بێت و لێی دەرنەچێت و بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە:

أ- ئەوە ڕەچاو بکرێت، کە مانای وشەکان بەو جۆرە بن، کە لە زمانی عەرەبی کاتی هاتنەخوارەوەی نیگادا هەبوون.

ب- ڕێساکانی ڕێزمانی عەرەبی و ئەو واتایانەی دەیبەخشن، ڕەچاو بکرێن.

ج- ڕێساکانی ڕەوانبێژی و واتاکانی ڕەچاو بکرێن، بەتایبەتی ئەو ڕێسایەی کە دەڵێت: نابێت وشە لە واتا ڕاستەقینەکەیەوە[١] بگۆڕێت بۆ واتایەکی خوازراو[٢]، مەگەر بە هۆی مەزندەیەکی[٣]تەواوەوە نەبێت.

٢. دوورکەوتنەوە لە تەئویلکردن، لە کاتی ڕوونکردنەوەی ئیعجازی زانستیی قورئاندا.

٣. نابێت بە هیچ جۆرێک ڕاستییەکانی قورئان جێگەی مشتومڕ و گریمانە بن، بەڵکو دەبێت ئەو ڕاستییانە بکرێن بە بنچینە و ئیتر هەر چییەک لەگەڵیاندا گونجا؛ وەربگیرێت و هەر شتێکیش دژ بوو لەگەڵیان؛ ڕەت بکرێتەوە.

٤. تەنیا بەو مەسەلە زانستییانە تەفسیری قورئان بکرێت، کە بەتەواوی چەسپاون و ڕاستی و دروستییان لە پلەی دڵنیاییدایە. نابێت ئەو گریمانە و بیردۆزانە بەکار بهێنرێن، کە هێشتا ساغ نەکراونەتەوە و هەر لە قۆناغی لێکۆڵینەوە و پوختکردندان. هەروەها هەرگیز نابێت قورئانی پیرۆز بە شتێک تەفسیر بکرێت، کە لەسەر گومان و گریمانە و خەمڵاندن دامەزرابێت، چونکە ئەم جۆرە زانیارییانە هەموو کاتێک ئەگەری دەستکاریکردن و ڕاستکردنەوە و ڕێککردنەوەیان هەیە، بگرە لەوانەشە بەتەواوی پووچەڵ بکرێنەوە.

---

[١] الحقيقة

[٢] المجاز

[٣] القرينة

## بەرهەڵستکارانی تەفسیری زانستیی قورئانی پیرۆز:

ئەو زانایانەی نوێنەرایەتیی ئەم دەستەیە دەکەن لەم سەردەمەدا:

- شێخی پێشووتری ئەزهەر؛ شێخ (محمود شلتوت)
- مامۆستا (سید قطب)
- (د. محمد حسین الذهبي)

ئەمانیش -واتە دەستەی بەرهەڵستکاران- دەڵێن:

١. قورئانی پیرۆز پەرتووکی ڕێنموویيکردنە، خوای گەورەش بۆ ئەوەی نەناردووە، کە ببێتە پەرتووکێکی وەها سەبارەت بە بیردۆزە زانستییەکان و وردەکاریی هونەرەکان و زانیارییە هەمەجۆرەکان بۆ خەڵکی بدوێت.

٢. تەفسیری زانستیی قورئان وا لە قورئانی پیرۆز دەکات، کە لە هەموو کات و شوێنێکدا لەگەڵ مەسەلە زانستییەکاندا بسووڕێتەوە، ئاشکراشە زانستەکان دامەزراوی و جێگیری و ڕای کۆتاییان تیا نییە.

٣. ئەوانەی خەریکی تەفسیری زانستیی قورئانن و خولیای ئەم جۆرە تەفسیرەن؛ وایان لێ دێت، پەنابەرنە بەر لێکدانەوەی دوور و بەزۆر سەپێنراو، کە ئەمەش پێچەوانەی ئیعجازە و شتێکی نەشیاو و ناڕێکیشە.

٤. پاشان دەڵێن: لەناو خودی قورئاندا، بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا هەیە لەسەر ئەوەی، کە خوای گەورە نەیویستووە قورئان ببێت بە کتێبێک بۆ ڕوونکردنەوە و باسکردنی وردەکاریی ڕاستییەکانی بوونەوەر.

ئەو بەڵگەیەش بریتییە لەوەی، کە لە (معاذ)وە دەیگێڕنەوە، کە بە پێغەمبەری (دروودی خوای لەسەر) وتووە: ئەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر)! جوولەکەکان دێنە لامان و پرسیاری زۆرمان دەربارەی مانگ لێ دەکەن، چی وا لە مانگ دەکات لە سەرەتادا بەباریکی دەربکەوێت و پاشان زیاد دەکات، تا تەواو پڕ دەبێتەوە و وەک بازنەی لێ دێت، لە پاشاندا وردە وردە کەم دەکات، تا وەک یەکەم جاری لێ دێتەوە. ئەوە بوو خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێت: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنْ الأَهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَاقِيتُ لِلنَّاسِ وَالْحَجِّ﴾ (البقرة:

١٨٩)، واته: "سەبارەت بە نوێبوونەوەی مانگ پرسیارت لێ دەکەن، بڵێ: بۆ زانینی کات و چوونە حەجی خەڵکییە."

بەڵام ئایا ئەم بەڵگانە بەسن بۆ ئەوەی تەفسیری زانستییان پێ ڕەت بکرێتەوە؟

- لە ڕاستیدا کاتێک، کە قورئان بریتییە لە کتێبی ڕێنموویکردن، ئەمە هەرگیز ڕێ لەوە ناگرێت، چەندین ئاماژەی زانستییشی تێدا بێت، کە قووڵبوونەوە لە زانستی نوێدا ببێتە مایەی ڕوونکردنەوەیان، چونکە قورئان باسی ئاسمان و زەوی و خۆر و مانگ و شەو و ڕۆژ و هەموو دیاردەکانی تری بوونەوەری کردووە، هەروەک باسی مرۆڤ و ئاژەڵ و ڕووەکیشی کردووە.

بە هیچ جۆرێکیش ئەم باسە بەربڵاوەی قورئان -لە بارەی ئەو شتانەوە- پێچەوانەی ئەوە نەبووە و نییە، کە قورئانی پیرۆز؛ پەرتووکی ڕێنموویکردنە.

بەڵکو ئەم باسکردنەی قورئان، یەکێک بووە لەو ڕێگایانەی، کە گرتوویەتیە بەر بۆ ڕێنموویکردنی خەڵک.

- سەبارەت بە پەیوەستکردنی ئەو ڕاستییانەش، کە قورئان باسیان دەکات، بە گریمانە زانستییەکانەوە، ئەوە کارێکی نەشیاو و ناپەسەندە، یەکەم کەسێکیش ئەم جۆرە کارەی ڕەت کردبێتەوە؛ ئەو کەسانەن، کە پەرۆشی تەفسیری زانستیی قورئانن.

- دەربارەی ئەوەش، گوایە ئەم جۆرە تەفسیرە هەمیشە بە (تەئویل) دەکرێت، هەروەها پێچوپەناکردن و زۆرلەخۆکردنی تیایە؛ ئەوا ئاشکرایە کە (تەئویل)ئەگەر هۆیەکی پەسەندی نەبێت ڕەت دەکرێتەوە، ئەوانەش کە بانگەشەی تەفسیری زانستیی قورئان دەکەن؛ چەند مەرجێکیان لەم بارەیەوە داناوە، وەکو ئەوەی کە نابێت واتای ڕاستەقینە بگۆڕدرێت بۆ مەجاز تەنیا بە هۆی بوونی چەند مەزندە و نیشانەیەکی هاوشانی ڕوون و ئاشکراوە نەبێت کە دەریبخەن لەو شوێنەدا واتا ڕاستەقینەکە مەبەست نییە.

- سەبارەت بە بەڵگەهێنانەوەش بەو ڕیوایەتەی وەک هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتی: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنْ الأَهِلَّةِ﴾ باسکرا؛ ئەوا پێویستی بەوەیە لە ڕووی سەنەدەوە بسەلمێنرێت، سەرەڕای ئەوەش ئە م ڕیوایەتە پێچەوانەیە لەگەڵ ئەو ڕیوایەتەی کە پێشەوا (الطبري) لە تەفسیرەکەیدا دەربارەی ئەم ئایەتە لە (قتادة)وە هێناویەتی:

پرسیارمان کرد لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر): ئەم گۆڕانکارییانەی مانگ بۆچی دانراوە؟ خوای گەورەش ئەم ئایەتەی لە بارەوە ناردە خوارەوە کە خۆتان دەیبیستن ﴿هِيَ مَوَاقِيتُ لِلنَّاسِ وَالْحَجِّ﴾، کە دایناوە بۆ ئاگاداربوونی مسوڵمانان لە کاتەکانی ڕۆژووگرتن و ڕۆژووشکاندن و درووشمەکانی حەج و زانینی عیددەی ئافرەتان و لە جێبەجێکردنی چەندین بواری ئایینیی تریشدا، خوای گەورەش خۆی زاناترە، کە چی باشە بۆ دروستکراوەکانی.

هەروەها بە هەمان جۆر لە (الربیع) و (ابن جریج)ەوە گێڕدراوەتەوە. لەم ڕیوایەتانەدا، کە پێشەوا (الطبري) هێناویەتی، دەردەکەوێت پرسیارەکە بەم جۆرە بووە:

ئایا گۆڕانکارییەکانی مانگ بۆچی دانراوە؟ نەوەک بەو جۆرە بێت کە بڵێت: مانگ چییەتی وا بەباریکی دەردەکەوێت و پاشان زیاد دەکات و ڕێک دەبێتەوە و دەبێت بە بازنە و دوایی کەم دەکاتەوە؟

لەبەر ئەوە ئەم ئایەتە هیچ بەڵگەیەکی تێدا نییە بۆ وەلانان، یان ڕەتکردنەوەی تەفسیری زانستی.

**پوختەی باسەکەش ئەوەیە:**

- ئەگەر تەفسیری زانستیی قورئان پشت ببەستێت بەو بیردۆزە زانستییانەی، کە نەسەلمێنراون و جێگیرنە بوون و نەگەیشتوونەتە پلەی ڕاستیی زانستیی تەواو، ئەوا ڕەت دەکرێتەوە.

- هەروەها ئەگەر واتاكانى قورئان لە چوارچێوەی زمانی عەرەبی بەرێتە دەرەوە، ئەوا ڕەت دەكرێتەوە.
- هەروەها كارێكی ناپەسەندە، ئەگەر لە زەمینەیەكی وەهاوە سەرچاوە بگرێت، كە زانستی ئەزموونی بكات بە بنچینە و قورئانیش بكات بە پاشكۆ و شوێنكەوتەی ئەو.
- بە هەمان شێوە ئەگەر پێچەوانە بوو لەگەڵ هەر واتایەكی تر، كە لە جێگەیەكی تری قورئاندا، یان لە فەرموودەیەكی ڕاست و دروستی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر) هاتبێت، ئەوا وەرناگیرێت.

- دوابەدوای ئەمانە دەكرێت بوترێت: ئەو كاتە تەفسیری زانستیی قورئان پەسەندە؛ ئەگەر پابەندی ئەو ڕێسایانە بێت، كە لە زانستی بنچینەكانی تەفسیردا باسكراون و زانراون، وەک پابەندبوون بە سنوورەكانی زمان و سنوورەكانی شەرع و پابەندبوون بەو توێژینەوە و بەدواداگەڕان و وریایی و ئاگاداربوونەی، كە پێویستن بۆ هەر یەكێک، كە بیەوێت لە قورئان بڕوانێت و ورد بێتەوە.
- لە كۆتاییشدا دەڵێین: تەفسیری زانستیی قورئان لە كەسێک وەردەگیرێت، كە خوای گەورە دەربارەی هەریەک لە قورئان (بنەماكانی تەفسیر) و ڕێساكانی بوونەوەریشەوە زانستی پێ بەخشیبێت و ناكرێت ئەم بابەتە لە كەسانی ناشایستەوە وەربگیرێت، چونكە قورئانی پیرۆز، كە پەرتووكی پەروەردگارە؛ زۆر لەوە گەورەترە، كە هەر كەسێک هەستێت و بێت بە كەیفی خۆی لێكی بداتەوە.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

# ڕاسپاردەکانی کۆنگرە[1]

پێشەکی:

بە یارمەتی و پشتیوانیی خوای گەورە، لە ماوەی (٢٥-٢٨/صفر/١٤٠٨ک بەرامبەر بە ١٨-٢١/ت١/١٩٨٧ز)دا، یەکەم کۆنگرەی جیهانی بۆ (ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا) لە شاری (ئیسلامئاباد)ی پاکستان بەسترا.

بە چاودێریی هاوبەشیی هەریەک لە:

- زانکۆی ئیسلامیی جیهانی لە ئیسلامئاباد
- دەستەی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا، کە بارەگاکەی لە مەککەی پیرۆزە.
- رابیطەی جیهانی ئیسلامی، کە هەر لە مەککەی پیرۆزە.

شایانی باسە ٢٢٨ زانا بەشدارییان لەم کۆنگرەیەدا کرد، کە لە ٥٢ دەوڵەتی جیهانەوە هاتبوون، هەروەها ١٦٠ چاودێریش ئامادە بوون.

لە کۆنگرەکەدا ٧٨ توێژینەوەی زانستی لە ١٥ پسپۆڕیی زانستی جۆراوجۆردا پێشکەش کران، کە لە نێوانی ئەو ٥٠٠ توێژینەوەیەدا هەڵبژێردرابوون، کە لە هەموو ناوچەکانی جیهانەوە گەیشتبوونە دەستی لیژنەی ڕێکخەری کۆنگرەکە.

توێژینەوەکان لە ٦ دانیشتنی گشتیدا و شانبەشانی چەند دانیشتنێکی کاری تایبەتمەنددا تاووتوێ کران و گفتوگۆیان لە بارەوە کرا.

هاوکات ٦ لە توێژینەوەکان وەلا نران، لەبەر ئەوەی خاوەنەکانیان لەوێ نەبوون بۆ پێشکەشکردنی.

واتای ئیعجازی زانستییش ئەوەیە کە: دۆزینەوە زانستییە نوێیەکان، کە بەتەواوی سەلمێنراون و جێگیر بوون؛ ئەو ڕاستییانە دەچەسپێنن، کە لە قورئانی

---

[1] لەبەر گرنگی ئەم ڕاسپاردانەی لەم کۆنگرەیەی کە ئەم توێژینەوانەی تێدا پێشکەشکراون ئەمەش خراوەتە سەر ئەم پەرتوکەکە.

پیرۆز و سوننەتی پاک و پاراودا هاتوون، ئەمەش بە چەندین بەڵگەی حاشاهەڵنەگر و دڵنیاییبەخش، کە پسپۆڕان لەسەریان پێک هاتوون و یەک دەنگن.

ئامانجیش لە سازدانی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لە بارەی ئیعجازی زانستییەوە ئەوەیە:

- راستگۆیی پێغەمبەر (محەمەد - دروودی خوای لەسەر) بسەلمێنێت بۆ کەسانی بێبڕوا و بۆیان دەربخات، کە ئەو ڕاستگۆ بووە لە گەیاندنی ئەو نیگایەدا کە هێناویەتی.
- هەروەها دەبێتە مایەی زیادبوونی باوەڕ و بەهێزبوونی دڵنیایی لە دڵی باوەڕداراندا.
- هەروەها شتە سەرسوڕهێن و نهێنییەکانی نێو نیگایان بۆ ئاشکرا دەکات و یارمەتییان دەدات بۆ ئەوەی لە حیکمەتەکانی تێبگەن و لە مانا وردەکانی حاڵی بن.

ئیعجازی زانستی.پشت بە ڕاستییە جێگیر و چەسپاوەکان دەبەستێت نەوەک بە گریمانە و بیردۆزەکان، ئەو ڕاستییانەش بە بەڵگەی یەکلاکەرەوە سەلماون و هەموو پسپۆڕانیش شایەتیی تەواوی و دروستییان بۆ دەدەن.

هەروەها پێویستە دەقێکی قورئان یان سوننەت واتای ڕاستییە زانستییەکە ببەخشێت و بە ڕێگەیەک لە ڕێگەکانی لێکدانەوەی شەرعی ئاماژەی بۆ بکات، بەگوێرەی ڕێزمان و مەبەستەکانی شەرع و بنچینەکانی تەفسیر.

ئەگەر هاتوو ئەو مەسەلەیەی وەک ڕاستییەکی زانستی باس دەکرێت لە هەموو واتاکانی دەقەکە بەدەر بوو؛ ئەوا هەرگیز ئەو مەسەلەیە ناچێتە چوارچێوەی ڕاستییەوە، نە لە واقیعدا و نە لە خودی شتەکە خۆیشیدا.

هەروەها پێویستە توێژەر لە بواری ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا یەکێک بێت لەو زانایانەی شایەتی کارامەیی زانستی لە بواری پسپۆڕیی خۆیدا بۆ درابێت و لەگەڵ ئەمەشدا توانای تێگەیشتنی دەقە شەرعییەکانی هەبێت لە

سەرچاوەکانی خۆیەوە، هەروەها بتوانێت بەپێی ڕێزمان و بنچینەکانی تەفسیر واتا و ماناکان لە دەقەکانەوە بدۆزێتەوە و دەریانبهێنێت.

بۆ ئەو مەسەلە و بابەتانەش، کە لەلای ئەو ڕووی ئیعجازەکە تێیدا شاراوەیە، پێویستە ڕاوێژ بە تایبەتمەندانی زانستە شەرعییەکان بکات.

وەهاش بە باش دەزانرێت کە توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستی لەلایەن چەندین دەستە و لیژنەی کارکردنی تایبەتمەندەوە ئەنجام بدرێن، کە کەسانی پسپۆڕ و شارەزا لە هەردوو بواری بوونەوەر و بوارە شەرعییەکەشەوە لەخۆ بگرن و بەهەماهەنگی هەموویان ئەو کارە ئەنجام بدرێت.

بەم جۆرە لیژنەکانی پسپۆڕی و دەستەکانی کارکردن، کە زانایانی تەفسیر و زانایانی بوونەوەریشیان لە خۆیاندا کۆ کردووەتەوە؛ بەردەوام بن لە ئامادەکردنی توێژینەوەکان و سازدانی لێکۆڵینەوەکان لە بواری ئیعجازی زانستیدا، تا ئەو کاتەی دامەزراوەی فێرکاری تایبەت دادەمەزرێت، کە کەسانێکی زانا (بە واتاکانی نیگا و بە ڕاستییەکانی زانست)ی لێوە دەربچێت.

### ڕاسپاردەکانی کۆنگرەکە:

ڕاسپاردەی یەکەم: خوێندنی بابەتی ئیعجازی زانستی لە زانکۆکاندا:

کۆنگرە، زانکۆ و دامەزراوە فێرکارییەکان ڕادەسپێرێت بەوەی لە بەرنامەکانی خوێندنیاندا بایەخ بدەن بە مەسەلەکانی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا، هەروەها کار بکەن بۆ ئامادەکردن و وتنەوەی ماددەیەکی نوێ لە هەموو کۆلێژ و پەیمانگەیەکدا، کە ئەم ماددەیە تەرخان بکرێت بۆ خوێندنی بابەتی ئیعجازی زانستی لەو ئایەت و فەرموودانەدا، کە دەچنە چوارچێوەی پسپۆڕیی هەریەک لەو کۆلیژانە یان پەیمانگایانەوە.

ئەمەش لە پێناو گرێدان و بەیەکەوەبەستنی ڕاستییەکانی زانست لەگەڵ نیگای خواییدا، بە مەبەستی قووڵکردنەوەی باوەڕ و بەهێزکردنی دڵنیایی لە دڵی خوێندکاراندا.

ڕاسپاردەی دووەم: ئامادەکردنی تەفسیرێکی ئاسان:

ڕاسپاردەی کۆنگرە بۆ (دەستەی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا)، ئەوەیە، کە بە هاوکاری و ڕێکخستن لەنێوان زانکۆکان و ناوەندەکانی توێژینەوە و دەستە و ڕێکخراوە ئیسلامییەکان لە وڵاتانی ئیسلامیدا؛ هەوڵی ئەوە بدەن تەفسیرێکی ئاسان بۆ قورئانی پیرۆز ئامادە بکەن، کە بە شێوەیەکی تایبەتی گرنگی و بایەخ بدات بەو ئایەتانەی دەربارەی بوونەوەر هاتوون.

ڕاسپاردەی سێیەم: وەرگێڕانی ماناکانی قورئانی پیرۆز:

هەروەها ڕاسپاردەیەکی تری کۆنگرە بۆ (دەستەی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا) ئەوەیە، کە بە هاوکاری و هەماهەنگی لەنێوان زانکۆکان و ناوەندەکانی توێژینەوە و ڕێکخراوە ئیسلامییەکاندا، هەوڵی ئەوە بدەن وەرگێڕانێکی ورد بۆ ماناکانی قورئانی پیرۆز ئامادە بکەن.

هاوکات ڕوونکردنەوەی تێروتەسەلی تیا بنووسرێت سەبارەت بەو ئایەتانەی دەربارەی بوونەوەرن، ئەمەش بۆ ئەوەی ببێتە یاریدەدەرێک بۆ توێژەرانی غەیری عەرەب لە بواری ئیعجازی زانستی لە قورئاندا.

ڕاسپاردەی چوارەم: بڵاوکردنەوەی گۆڤارێکی زانستی:

کۆنگرە، (دەستەی ئیعجازی زانستی) ڕادەسپێرێت بە دەرکردنی گۆڤارێکی زانستیی خاوەن ئاستێکی جیهانیی باڵا بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی، کە بایەخ بدات بە بڵاوکردنەوەی توێژینەوە تایبەتمەندەکانی بواری ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا، دوای ڕێپێدان بەو توێژینەوانە لەلایەن پسپۆڕانی زانستە ئیسلامییەکان و زانستەکانی بوونەوەرەوە.

ڕاسپاردەی پێنجەم: هاندانی توێژینەوەکانی ئیعجاز:

ڕاسپاردەی کۆنگرە بۆ زانکۆکان و ناوەندەکانی توێژینەوە لە وڵاتانی ئیسلامیدا، ئەوەیە، کە هانی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکانی بواری ئیعجازی زانستی

له قورئان و سوننەتدا بدەن و دەرفەتی خوێندن بۆ قوتابییانی خوێندنە باڵاکان تەرخان بکەن و خەڵاتی دارایی بۆ غەیری قوتابیانیش لە توێژەرانی ئەم بوارە دابین بکەن.

<u>ڕاسپاردەی شەشەم:</u> ناوەندەکانی توێژینەوەی ئیعجازی زانستی:

ڕاسپاردەی کۆنگرە بۆ زانکۆکان و دامەزراوە زانستییەکان و دەستە و ڕێکخراوە هەڵسووڕاوەکانی بواری بانگەوازی ئیسلامی لە جیهانی ئیسلامیدا، ئەوەیە: ناوەندی تایبەتمەند بۆ توێژینەوەکانی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا دابمەزرێنن، هەروەها زانکۆی ئیسلامیی جیهانی لە ئیسلامئاباد ڕادەسپێرێت بەوەی دەستپێشکەری بکات بۆ دامەزراندنی یەکەم ناوەند بۆ ئەم مەبەستە.

<u>ڕاسپاردەی حەوتەم:</u> پشتگیریی دارایی بۆ دەستەی ئیعجازی زانستی:

کۆنگرە داوا لە حکومەتەکان و دەستە و دامەزراوە داراییەکان و سەرمایەگوزارانی وڵاتانی ئیسلامی دەکات کە یارمەتیی دارایی پێشکەش بکەن بە دەستەی ئیعجازی زانستی، هەروەها بەو ناوەند و مەڵبەندی توێژینەوانەش کە دەزگا دایاندەمەزرێنێت، تاوەکو بتوانێت چالاکییەکانی خۆی هەڵسووڕێنێت و ئەو ئامانجانە بەدی بهێنێت، کە لە پێناویدا دامەزاروە، لە نموونەی: سازدانی کۆنگرە و کۆڕ و کۆبوونەوەکانی توێژینەوە و ئامادەکردنی ئەو توێژینەوە و لێکۆڵینەوانەی دەبنە مایەی قووڵکردنەوە و پتەوکردنی باوەڕ و بەهێزکردنی دڵنیایی لە دڵی باوەڕداراندا، هەروەها کەسانی نامسوڵمانیش بە زمانی سەردەم بانگ دەکەن، کە زمانی زانستە و ئەوان لە بواری وەرگرتنی باوەڕدا یەکلاکەرەوەیە و پێی ڕازین. ئەمەش بۆ ئەوەی هەڵسوڕاوانی دەستەی ئیعجاز هەستن بەبەجێگەیاندنی ئەرکی سەرشانی نەتەوەی ئیسلام لە بواری ڕاگەیاندنی بانگەوازی ئیسلام بە بەڵگە و نیشانەی سەلمێنراوەوە.

<u>ڕاسپاردەی هەشتەم:</u>بانگەواز بۆ ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستیی ڕەسەن:

ڕاسپاردەیەکی تری کۆنگرە بۆ دەستەی ئیعجازی زانستی و لایەنەکانی تریش ئەوەیە، گرنگی بدەن بە سازدانی کۆڕی تایبەتمەند و کۆبوونەوەی جۆراوجۆر بۆ توێژینەوە و بایەخ بدەن بە پێکهێنانی چەندین دەستەی کارکردن و لیژنەی پسپۆڕی، ئەمەش لە پێناو پەرەپێدانی توێژینەوەکان لە بواری ئیعجازی زانستیدا و دانانی نەخشەیەکی تێروتەسەل بۆ ئەم مەبەستە و بڵاوکردنەوە و دابەشکردنی ئەم نەخشەیە بەسەر زانکۆکان و مەڵبەندەکانی توێژینەوەی ناوەوە و دەرەوەی وڵاتانی ئیسلامیدا، وەک ڕێخۆشکردنێک بۆ سازدانی کۆنگرەی خولی، کە ئەم توێژینەوە نوێیانەی تێدا بخرێتە ڕوو.

<u>ڕاسپاردەی نۆیەم:</u> توێژینەوە زانستییەکان و دۆزینەوە نوێیەکان:

کۆنگرە، زانکۆ و ناوەندەکانی توێژینەوەی وڵاتانی ئیسلامی و زانایانی مسوڵمان لە جیهاندا بانگهێشت دەکات بۆ هاوکاری کردن لە پێناو ئامادەکردنی نەخشەیەکی تێروتەسەل بۆ توێژینەوە لە بوارە زانستییە هەمەجۆرەکاندا و پاشان کارکردن بۆ جێبەجێکردنی نەخشەکە  بە هاوکاری و هەماهەنگیی هەردوولایان.

ئەمەش وەک بەدەمەوەچوونێک بۆ قورئانی پیرۆز، کە مسوڵمانان بانگهێشت دەکات بۆ گەڕان و ڕوانین و وردبوونەوە لە نیشانەکانی خوای گەورە لە ئاسۆکانی بوونەوەر و لە خودی مرۆڤدا، بە مەبەستی دۆزینەوەی ڕاستییە زانستییەکان و ڕێساکانی بوونەوەر و بەکارهێنانیان لە دەستەبەرکردنی ڕێگەکانی بەهێزی و هۆکارەکانی سەبەرزی بۆ مسوڵمانان، تاوەکو ڕزگاریان بێت لە پاشکۆیەتیی بۆ غەیری خۆیان لە بواری زانستەکان و تەکنەلۆژیادا.

هەروەها کۆنگرە ئامۆژگاریی حکومەتە ئیسلامییەکان دەکات بۆ گرتنەبەری چەند هەنگاوێکی زانستیی گونجاو، بە مەبەستی ڕاکێشانی ئەو عەقڵە ئیسلامییانەی کۆچیان کردووە بۆ هەندەران تاوەکو بەشداری بکەن لە پەرەپێدان و پێشخستنی کۆمەڵگەکانی خۆیاندا.

هەروەها کۆنگرە ئامۆژگاریی دەزگا و دامەزراوە داراییەکان و سەرمایەگوزاران دەکات بەوەی بەشداری بکەن لە دەستگیرۆیی ئەو پرۆژەی توێژینەوانەدا کە زانکۆکان و ناوەندەکانی توێژینەوە و تاکەکەسەکان ئەنجامی دەدەن.

راسپاردەی دەیەم: بڵاوکردنەوەی توێژینەوەکانی کۆنگرەکە و ڕاگەیاندنی ئەنجامەکانی:

کۆنگرە، دەستەی ئیعجازی زانستی ڕادەسپێرێت بەوەی، کە توێژینەوەکانی ئەم کۆنگرەیە، دوای پیاچوونەوەیان لەبەر ڕۆشنایی ئەو گفتوگۆ و تاووتوێکردنانەی لە دانیشتنەکانی کۆنگرەدا ئەنجام دراون، لەگەڵ ڕاپۆرت و ڕاسپاردەکانی کۆنگرەدا، بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی بڵاو بکاتەوە. هەروەها بە مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجی توێژینەوەکان، هەوڵ بدات لە بواری بانگەوازدا بۆ ئیسلام سوود لە ئەنجامەکانیان وەربگرێت. لەم بوارەشدا پشت ببەستێت بە ئامرازە تەکنیکییەکانی سەردەم لە ڕووی دەرهێنان و خستنەڕوودا، هەروەها هۆکارە نوێیەکانی ڕاگەیاندن لە بواری کارتێکردن و قایلکردندا بەکار بهێنێت.

هەروەها ڕاسپاردەیەکی تری کۆنگرە بۆ دەستەی ئیعجاز ئەوەیە، زنجیرە وتارێک ئامادە بکات، کە لە زانکۆ و پەیمانگەکاندا پێشکەش بکرێن و داوا لەو زانایانە بکات، کە بایەخ بەم بابەتە دەدەن بۆ ئەوەی ئەوان ئەو وتارانە پێشکەش بکەن.

هاوکات بانگهێشتی ڕۆژنامەکان و هۆیەکانی ڕاگەیاندن لە وڵاتانی ئیسلامیدا بکات بۆ بەشداریکردن، بە دانانی بەرنامە و بڵاوکردنەوەی نووسین و وتار لەم بوارەدا.




**سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی**

سەنتەرێکی کوردستانیی ناحکومیی ناسیاسییە، گرنگیی دەدات بە توێژینەوە و تاوتوێکردنی پرسە هزرییە بنەڕەتییەکان بۆ دووبارە هێنانەگۆی دەق و تێکستە پیرۆزەکان و چۆنیەتی دابەزاندنی چەمکە مەعریفی و بەبایەخەکانی ئیسلام لە بوارە جیاوازەکانی سەردەمدا. لە سۆنگەی ئەوەوە کە هزر و بیری ڕەسەن و قووڵ بنچینەی تێگەیشتنی ڕاست و دروستە بۆ دەقەکانی قورئان و سوننەت و دەستەبەری لێکدانەوەی گونجاوە بۆیان.

سەنتەر هەوڵی ڕەخساندنی کەشوهەوای گونجاو دەدات بۆ کارابوونی عەقڵ و بیر و ڕانانی هزریی، لەم پێناوەدا سەنتەر هەردوو سەرچاوەی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی بەرز و بەڕێز بە بەکارهێنانی ئامرازی زانستە ئیسلامییەکان و زانستەکۆمەڵایەتی و سروشتییەکان دەکاتە بنەمای کارەکانی.

**بوارەکانی کارکردن:**

- نووسین بە قەڵەمی خۆماڵیی نووسەرانی کورد و بیرمەندان.
- وەرگێڕان لە زمانە جیاوازەکانەوە بۆ زمانی کوردیی، لە پێناو دەوڵەمەندکردنی کلتووری کوردییدا.
- بەستنی کۆنگرەی زانستی و کۆڕ و سازدانی سیمینار لە لایەن خاوەن بیر و ئەکادیمیانەوە.
- خولی ڕاهێنان و وۆرکشۆپ لە لایەن کەسانی پسپۆڕ و خاوەن بڕوانامەی زانکۆییەوە .
- هاوکارییکردنی دامودەزگا و دامەزراوە ئەکادیمییەکان و زانکۆکان لە پێناو پەرەپێدانی ئاستی زانستیی.



ئەم توێژینەوانەی لەم پەرتوکەدا هاتوون بریتین لە گوڵبژێرێك لەو توێژینەوانەی کە پێشکەشکراون لە (کۆنفرانسی یەکەمی جیهانی بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا) لە ئیسلامئابادی پایتەختی پاکستان بەڕێوەچوو، ئامانج لە هەڵبژاردنیان لە دووتوێی ئەم کتێبەدا، هەروەکو لە ناونیشانەکەیەوە دیارە؛ ساغکردنەوەی بنەڕەتەکانی ئیعجازی زانستییە لە قورئان و سوننەتدا، چونکە بواری ئیعجازی زانستی وەکو بەشێکی نوێ لە باسەکانی ئیعجازدا، ئەوە دەخوازێت کاری بنەڕەتدۆزیی (تأصیل)ی بۆ ئەنجام بدرێت و ئەو دەقانەی قورئان و سوننەت دەستنیشان بکرێن، کە بوون بە بنچینە و بنەڕەتی ئیعجازی زانستی، بە واتایەکی تر: باسکردن لەوەی کە ئایا ئیعجازی زانستی لەسەر کام دەقانە دامەزراوە.

نرخ (٣٠٠٠) دینار